ئاتین دولابۆتی

# خۆبەکۆیلەکردن

## نامەیەك لەبارەی سیاسەتی ملکەچییەوە

و: ڕێبوار سیوەیلی و مراد حەکیم

کوردستان

هەولێر - ٢٠٠٤

زنجیرەی هزری سیاسی


**ناوی کتێب: خۆبەکۆیلەکردن**

نامەیەك لەبارەی سیاسەتی ملکەچییەوە

نووسین: ئاتین دولابۆتی

وەرگێڕانی: ڕێبوار سیوەیلی و مراد حەکیم

نەخشەسازی ناوەوە: مراد حەکیم

بەرگ: هۆگر سدیق

پیتچنین: زرار حەسەن

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ٥٠٨

نرخ: ١٥٠٠ دینار

چاپی یەکەم: ٢٠٠٥

چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ٤- (١٠٧)



ناونیشان

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

پشت ڕۆژنامەی خەبات

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن: 2260311

پێشکەشە بە
حەیدەر لەشکری



## ناوەرۆك

## مرۆظ و ستەمکاری

ئەو دەمەی *نیتشە* لە کتێبی **(ئەودیوی چاکە و خراپەدا)** نووسی: ((لەو رۆژگارەوە کە مرۆڤ هەبووە، ڕانەمرۆییەکانیش هەبوون و بەهەمان شێوەش ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانپێکراوان لەبەرامبەر فەرماندارانـدا، پێویستیی مرۆڤ بە ملکەچی ئەوەندە بۆتە شتێکی خۆڕسك، ئیدی ئەم پێویستییە لە پێگەی ویژدانێکی ڕەسمیدا حوکمی کردووە: دەبێ تۆ بێ ئەملاوئەولا ئەمە بکەیت و ئەوە نەکەیت و لە ئەنجامی ئەوەشەوە غەریزەی ملکەچی بەکۆمەڵی بەمیرات بۆ مرۆڤ مایەوە کە خۆشەویستی بۆ هاوچەشن لەچاو ترس لە هاوچەشن ببێتە شتێکی لاوەکی و بەم پێیەش ئەخلاقی ڕانەمەڕی و ئەخلاقی ترسەنۆکی ئامانجی خۆی بەدەستهێنا))، لەڕاستیدا نیتشە بەم لێکدانەوەیەی هیچ شتێکی ئەوتۆی نەدەخستە سەر قسەکانی *لابۆتی* کە زۆر پێشتر گوتبووی: ((یەکێ لە تایبەتمەندییە سەخیفەکانی چەشنی مرۆڤ ناچاربوونە بە ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانە لەبەرامبەر ستەمدا)). لابۆتی نەك هەرتەنیا ڕچەشکێنی نیتشەیە سەبارەت بە تێگەیشتن لەم چەمکە و پەیوەستکردنی ستەمکاری و ملکەچی بە سروشت و غەریزەی مرۆڤەوە، بەڵکو ئەوان لە ڕەخنەگرتنیان لە ستەمکاری و زۆرداریش بەهەمان توندی قسان دەکەن کە سەبارەت بە ئازادی دەیانکرد. بۆیە هەرچەندە ئەم نامەیەی لابۆتی کۆنە و لەبارەی سیاسەتی ملکەچی و خۆبەکۆیلەکردنەوەیە، کەچی لە خستنەڕووی باسەکانیدا تابلێی نوێ و نزیك لە ڕۆح و لە ناوەڕۆکیشدا ئەم نامەیە هیچ



نییە جگە لە بەرگریکردنێکی سەرسەختانە لە ئازادی مرۆڤ. مرۆڤێ کە بەبڕوای لابۆتی بەسروشتی خۆی ئازادە.

ئەرێ بەڕاست هەرگیز لە خۆتان پرسیوە ستەمکاران بۆچی هێندە مرۆڤی ملکەچ و نزم و دوو ڕووی مەراییکەر و کاسەلێسیان خۆشدەوێ و ئاوا بە لێشاو لە کەلێن و قووژبنی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی خۆیانیان دەپەستێون؟ ئەرێ بەڕاست ئەو هەموو جاسووس و ڕیشوەخۆر و جەللاد و داوێنپیس و تەزویرچییانە لە چوارچێوەی ڕژێمێکی وەك بەعسدا چلۆن جێگەیان دەبۆوە و چەندیشی دەوێ تا ئێمە لەنێو ئەزموونی ئیداریی خۆمانیان وەدەرنێین؟ قەت لەخۆتان پرسیوە بۆچی هەتا مرۆیەکی شایان و ژیر و بە ویژدان لەناو تۆڕەکانی دەسەڵات و بڕیاردانـدا جێی دەبێتەوە، چلۆنە سەدان و هەزاران کاسەلێس و درۆزن پێگەکان داگیر دەکەن و پانتایی ئەو زەلکاوە بەرفراواندەکەن کە گەرای ستەمکاری لێوەی سەرهەڵدەدا..

ئەگەر بۆ پەیداکردنی وەڵامی ئەو پرسیارانە بە مێژووی ستەمکاریدا ڕۆبچین، تێدەگەین کە ستەمکاران ڕێسایەکی نەگۆڕیان هەبووە بۆ خەساندنی مرۆڤ و دروستکردنی ترسێکی کوشندە سەبارەت بە ئازادی. ستەمکار ئەو پسپۆڕەیە گەر بمانەوێ لەژێر چاودێری ئەودا بڕوانامەیەکمان هەبێ، ئەوە یەکەم لێکچەری ئەو بریتیە لە دروستکردنی ترس لە ئازادی. هەر بۆیەشە دیوی ڕاستەقینەی ئەو خۆبەکۆیلەکردنەی لابۆتی لەم نامەیەدا باسی دەکات و سوورە لەسەر بەدەستهێنانەوەی، بریتیە لە ئازادی و دەتوانین بڵێین: لە پشت هەموو دێڕەکانی ئەم نامەیەوە کە تیایدا ستەمکاری شییدەکرێتەوە و ستەمکاران ڕیسوا دەکرێن، پێناسەیەکیش بۆ ئازادی بەرهەمدەهێنرێ. بۆیە دواجار لابۆتی هەرتەنیا نووسەرێك نییە لەسەر کاغەز داوای ئازادی بۆ مرۆڤ بکات، بەڵکو ئەو

ئازادیخوازێکە پێشنیاری پراکتیکی و واقیعی دەخاتە بەردەم مرۆڤەکان بۆ سەندنەوەی ئازادییە زەوتکراوەکەی خۆیان و فێرمان دەکات چۆن دەسەڵات و هێز لە ستەمکاران بستێنینەوە، چیدی بەردەوامی نەدەین بە ملکەچیی خووپێوەگرتوومان و چیدی چێژ لە خۆبەکۆیلەکردن وەرنەگرین: **ئێوە دەتوانن خۆتان لەم خۆبەکەمزانی و پیسیە ڕزگار بکەن.. ئەمەش بێ ئەوەی هیچ هەنگاوێك هەڵبێنن، تەنیا ئەوەندە بەسە خواستی ئازادیتان هەبێت، هەرکات بڕیار بدەن چیدی کۆیلە نەبن، یەکسەر ئازاد دەبن.** بەلای *لابۆتییەوە* بڕیارەکە بڕیارێکی عەقڵانی و بڕیاردەریش مرۆڤێکی خاوەن خودە، کە لەبەرامبەر خۆبەکۆیلەکردنی خۆیدا هوشیار بۆتەوە. بەڵام ئەم قسانە وەها تێنەگەین کە لابۆتی مرۆڤێکی خۆشباوەڕ و ئایدیالیستیە و وادەی ئەوەمان پێدەدات ئەگەر ئەمشەو بڕیار بدەین چیدی کۆیلە نەبین، سبەی وەك مرۆڤی ئازاد خەبەرمان دەبێتەوە. *لابۆتی* بیرمەندێکی قووڵ و بەئەندازەی ئەوەش واقیعی و کۆنکرێتییە. واقیعیبوونی *لابۆتی* لە خستنەڕووەکانیدا لەوەدایە کە ئەو خولیای یۆتۆپی و ئایدیالیستانەمان ناخاتە سەرەوە، پێمان ناڵێت ڕێگای گەیشتن بە ئازادی ئاسان و بێچوورتوم و ئەوەتا لەوێدایە و ئەمەش ڕەچەتەکەیەتی، بەڵکو ڕاشکاوانە دەیدا بە گوێماندا و دەڵێت: ئەوانەی ئەڤینی بەدەستهێنانەوەی ئازادییان لەسەردایە، لەسایەی دەسەڵاتی ستەمکاراندا ناتوانن هیچ کاریگەرییەك لەسەر کۆمەڵگا دابنێن. چونکە تەنانەت ئەگەر ژمارەشیان زۆر بێت، ئەوە هیچ پەیوەندییەکیان لەنێواندا نییە و بەیەکتری نامۆن. ئەوان لە ژێر ستەمی زۆرداردا ئازادی کارکردن، ئازادی قسەکردن و تەنانەت ئازادی بیرکردنەوەش لەدەست دەدەن و لە خەونەکانیاندا بەتەنیا دەمێننەوە. بەم پێیەش کاری ئازادیخوازان هەر تەنیا بڕیاردانێکی خێرا نییە، هێندەی ئەوەی خۆسەلماندنە لە سەر ئاستی کارکردن و قسەکردن و بیرکردنەوە



لە ناو کەشێکدا کە ستەمکاران زەوتیانکردووە. لە کۆی قسەکانی *لابۆتیدا* ئەوە بەدیار دەکەوێ کە مرۆڤ بە سرووشتی خۆی ئازادە، بەڵام لە جیهانێکدا چاودەکاتەوە کە لەلایەن ستەمکارییەوە داگیرکراوە و سیاسەتی ملکەچی تێدا پیادە دەکرێ. ئەمەش وادەکا مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە خوو بە ملکەچی و چێژ لە خۆبەکۆیلەکردن وەربگرێ و خۆی لە ئاست زۆرداراندا بچووکبکاتەوە. بەم پێیەش ئەو لەگەڵ لەدایکبوونیدا مرۆڤبوونی خۆی لێسەندراوەتەوە و تەنیا ڕێگایەکیش بۆ بەمرۆڤکردنەوەی خۆی و بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی ملکەچی، بڕیاردانیەتی بەوەی کە ئازاد بێت. لێرەشەوە *لابۆتی* ئازادی دەکاتە مەرجی مرۆڤبوون و ئازادیخوازییش دەکاتە ئەخلاقی دژ بە ستەمکاری.

## سیاسەت و ستەمکاری

سیاسەت تەنیا یەك ڕێگای لەبەر دەمدایە بۆئەوەی لە دژی زۆر و ستەم بەرگری لەخۆی پێبکات، کە ئەویش عەقڵانیەت و ئەخلاقی سیاسیانەیە. کە سیاسەتمان لە عەقڵانیەت و ئەخلاق بەتاڵکردەوە، ستەمکاری و دڕندەیی سەرهەڵدەدەن و لەپەراوێزی ئەمانەشدا جۆرەکانی گەندەڵی و پیلانگێڕی دەبنە بەشێ لە ژیانی ئیداری و لە ئاستی کۆمەڵایەتیشدا، قەیرانی بەهاکان و بەدگومانی و بڕواهێنان بە ڕێکەوت و قەدەر پەرە دەستێنن. ستەمکاری پێویستی بە سیاسەت نییە، چونکە سیاسەت بەر لەهەر شتێ زانستی بەڕێوەبردنی ئەخلاقیانەی کۆمەڵگا و هاندەری دروستبوونی خودێکی کۆمەڵایەتییە کە لەمیانەی بەشداربوونی لە ململانێ کۆمەڵایەتیەکاندا، وەك هاوڵاتی دەرووەست بە ژیانی هاوبەشەوە، خۆی دەسەلمێنێ. لەکاتێکدا ستەمکاری گاڵتەکردنە بە خودی کۆمەڵایەتی و هەڵگێڕانەوەیەتی بۆ ئاپۆرە و زۆربەیەکی بێدەنگ. ئەمە جگە لەوەی

ستەمکاری بەتاڵکەرەوەی هەموو هاندەرێکە لە تاکەکەسدا بۆ ئەوەی بیکاتە دەستوپێوەند و کاسەلێس و مەراییکەر و مرۆڤێکی دووڕووی بێ ئیرادە، تاکو نەتوانێت لەدەرەوەی ئەو سنوورەی ستەمکار بۆی دەستنیشاندەکات، بیر لە ژیانی مرۆڤانەی خۆی بکاتەوە. *لابۆتی* بە ڕوونی ئەوە دەستنیشاندەکات و دەڵێ، **دەستوپێوەندەکانی زۆردار خۆیان نەفی دەکەن و هەرچی لە دەستیان دێ دەیکەن بۆ ئەوەی ڕەزامەندی زۆرداران وەدەستبهێنن، نەك بۆ ئەوەی بۆخۆیان ژیانێکی ئاسایی بژین**. بەودیوی تردا، ستەمکاری پێویستیشی بە ئەخلاق نییە، چونکە ئەخلاق ئەو گەرانتەیە کە ناهێڵێ سیاسەت لە ویژدان و دادپەروەری دابڕێ. بەمانایەك لە ماناکان، ئەخلاق **یادوەری** سیاسەتە و ئەو سیاسەتەی یادوەری خۆی نەبێت ڕێگە بەخۆیشی دەدات نائەخلاقیانە خۆی بسەپێنێ. لە کاتێکدا ستەمکاری بەهۆی ئەو دابڕکردنەی ئەخلاق لە سیاسەت، خۆی ئاراستە دەکات و بەبیانووی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ بێ سەروبەرەییدا، کۆمەڵگا دەکاتە گۆڕەپانی زۆردار و چەوسێنەران. لێرەدایە کە تێدەگەین بۆچی ستەمکاران بە درێژایی مێژوو، هەر لەو دەمەیڕا کە قەڵانشین بوون هەتا ئێستا کە نیشتەجێی دوایین مۆدێلەکانی نەخشەی بیناسازین، بەردەوام لە پشت مێز و ئەودیو پەنجەرەی کۆشك و نوسینگەکانیانەوە، ددان لە خەڵکی چیرڕ دەکەنەوە و وێنەی تاوانبار و خراپەکاریان پێدەبەخشن. ستەمکار کائینێکە ناتوانێت یەك ڕۆژ لەسەر حوکم بمێنێتەوە ئەگەر بەردەوام وەك تاوانکار و مەترسی و هەڕەشەیەك بیر لە خەڵك و گرووپ و تاکەکان نەکاتەوە لەسەر خۆی. بۆیە یەکێ لە میکانیزمەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکاران لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا، نەك هەر کردنەوەی کۆمەڵگا نییە، بەڵکو گۆڕینی کۆمەڵگایە بۆ بەندیخانەیەکی گەورە کە تیایدا کاسەلێس، دەستوپێوەند، هەلپەرست و



مشەخۆرەکان وەك (دۆست) تەماشایان دەکرێ و کەسانی سەربەخۆ و ئازادیخواز و خاوەن قسەش دەخرێنە بەرەی دوژمنەوە. ئەگەرچی پێوەری جیاکردنەوەی ئەمانەش بە درێژایی مێژووی ستەمکاری جیاواز بووە، بەڵام لەسەر یەك بنەمای نەگۆڕ بەرێوە چووە: ئەگەر لە ئێمەی، دۆستمانی، ئەگەر لە ئێمەش نیت، هەرچییەك بیت، دوژمنمانی. لەبەرامبەر ئەم سیاسەتی هەڵشێلان و تواندنەوەیەدا کە سیاسەتێکە لەدژی جیاوازیی، وەك *لابۆتیش* ئاماژەی پێکردووە، ستەمکاران لەپێناوی هێنانە ناوی هەرچی زیاتری ژمارەیەکی زۆرتری خەڵك بۆ ناو ئەو زەلکاوەی دروستیانکردووە، مەسرەف و پارەیەکی زۆر سەرف دەکەن، پاداشت دەبەخشنەوە و ڕیشوەخۆری ڕەواج پێدەدەن و بەهۆی تەدارەکی بەردەوامی بۆنە و ڕێ و ڕەسمەکانیشەوە، زۆرترین سەرگەرمی و هەلی خلافاندن بۆ خەڵکی دروستدەکەن و گیانی مشەخۆری و دووڕوویی تێدا دەخەملێنن. بەوجۆرەش کولتوورێك بەرهەم دەهێنن کە بێدەنگکردن و سانسۆر و لەژێر لێوەوە قسەکردن لە دیارترین خەسڵەتەکانێتی.

## کولتووری ستەمکاری

ستەمکاری نەك هەر شێوازێکی لەڕێ لادانی سیاسەتە لە دەسەڵات، بەڵکو شێوازێکی لە قاڵبدانی جەستەیشە لە چوارچێوەی بوونی کۆمەڵایەتیانەی خۆیدا و سەپێنەری ڕستێکە لە جوڵە و بزاوتن و خوو بەسەر جەستەدا تا نەهێڵێت وەك جەستەیەکی ئازاد و سروشتیی خۆی بنوێنێ. کولتووری ستەمکاری کولتوورێکە ئەوەندەی ڕقی لە دەم و لێوی قسەکەرە، ئەوەندەش دەم و لێوی لەرزیو و بێدەنگی خۆشدەوێ. ئەوەندەی ڕقی لە دەستی ئاماژەکەر و ئامێزی کراوەیە، سەدان ئەوەندەش شانی تەپیو و دەستی بە لەشەوە نووساوی خۆشدەوێ و

دەســتەونەزەر ڕاوەســتان بەیــەکێ لــە جــوانترین شــێوەکانی وەســتان لێکدەداتەوە. چەندە ئەو چاوانەی خۆشدەوێ کە ڕوویان لە زەوییە و بەتاڵن لە نیگا، ئەوەندەش بە دیتنی ئەو نیگایانەی پڕن لە بینین و تەماشا هەراسان دەبێت. گەردنی بەرز قەڵایەکی داگیرنەکراو بیری ستەمکار دەهێنێتەوە، لە کاتێکدا گەردنی کەچ و ملی بەلارەوە بوو دڵنیایی پێدەبەخشن. ستەمکاران چونکە پابەند نین بە زەوییەوە و ڕێز لەو خاکە ناگرن کە لەسەری دەژین، هەمیشە لە هەوڵی پیشاندان و سەلماندنی ئەوەدان کە ئەو شتانەی لە عەردەوە نزیکن کەمبایەخترن لەو شتانەی لە ئاسمانەوە نزیکن. هەر بۆیەشە بەپیرۆزکردن (تقدیس) یەکێکە لەو میکانیزمانەی کە دەستوپێوەندەکانی ستەمکار پەنای بۆدەبەن تاکو لەو ڕێگەیەوە پێمان بڵێن ستەمکار بوونێکی دەرەمرۆیی و باڵایە. لەم پێودانگەیشەوە بایەخێکی زۆر دەدەن بە شێوەکانی نووشتانەوە و کڕنووش بردن و خۆ بەسەر پێداادن و قۆندەرە ماچکردن، تاکو لەو ڕێگایەوە مرۆڤ بکەنەوە بە ئاژەڵ و نزیکی بخەنەوە لە نزمایی و ناچاری بکەن بەوەی قاییل بێت کە شوێنی ئەو ئەوەتا لەوێ، لەو خوارەوە.

## بەعسناسیی لابۆتیانە

بایەخی دەقەکەی *لابۆتی* هەرتەنیا لەوەدا کورتناکەینەوە کە دەلاقەیەکیترە بۆ بەرەنگاربوونەوە و تێگەیشتن لە جۆرێ لە ستەمکاری کە گەلانی عێراق ماوەی سی و پێنج ساڵ زیاتر لەسایەیدا دەیان ناڵاند. وەلێ بەڕاستی ئەو قسانەی لابۆتی لەسەر ستەمکاری دەیانکات بایەخدارترن لە زۆرێك لەو نووسینانەی لەسەر بەعس بڵاو دەبنەوە، کە ئەزموونێکی زۆر نزیکە لە ژیانی ئێمەوە. یەکێ لە ڕستە گرنگەکانی لابۆتی سەبارەت بە تێگەیشتنی ئێمە لە بەعس ئەوەیە کە دەڵێ، ڕاستە



**بەستنەوەی خەڵك لە سەرەتادا کارێکی قوورسە، ئەویش بەجۆرێ کە پێویست دەکا زەبر و زۆری تێدا پیادە بکرێ. وەلێ ئەوەش ڕاستە کە نەوەی دواتر بە ئاسانی ملکەچ دەبن.** لەم تێگەیشتنەوەیە کە دەکارین بڵێین، چەسپاندنی زوڵم و ستەمکاری لەسەرەتاوە قوورسە، بەڵام دواجار پەسەند و قەبووڵ دەکرێ. ئەو بەرەنگارییەی لەگەڵ هاتنە سەرحوکمیاندا، بەعسییەکان لەلایەن مرۆڤی عێراقییەوە ڕووبەڕووی بوونەوە، لەگەڵ ئەو لافاوی بەبەعسیبوونەدا بەراورد ناکرێ کە هەمان ئەو خەڵکە بەدرێژایی تەمەنی ئەو ڕژێمە لە عێراقدا بە پیرییەوە چوون. بەعسییەت هەر تەنیا وەك ئینتیمایەکی کاتی لە ژیانی عێراقییەکاندا نەمایەوە، بەڵکو بووە کولتوورێکیش کە ماوەیەکی زۆری دەوێ تا بەتەواوی بەهاکانی نرخیان نامێنێ. بۆیە کاتێك بەعس وەك سیستەم نامێنێ، ئەوە لە کۆویژدانی خەڵکانێکی زۆردا بەرەنگاری ئەو ئازادییە دەکرێ، کە بەعس زەوتی کردبوو. هۆکاری ئەمەش ڕەنگە لەوەدابێ، کە نەوەکانی دوایی لەم وڵاتەدا، بە پێچەوانەی ئەو نەوەیەوە کە لەکاتی هاتنە سەر حوکمی بەعسییەکاندا بەرەنگارییان دەکرد، بۆ تاقە ڕۆژێکیش لە ژێر سایەی بەعسدا ئەزموونی ئازادیی ڕاستەقینەی لە ژیانی خۆیدا نەکردووە. لێرەشەوە سەبارەت بەم نەوانە بەهای کۆیلەبوونی خوو پێوە گرتوو چەندین جار لە بەهای ئەو ئازادیە زیاترە. نە بەعس و نە هیچ ستەمکارێکی دی لەم وڵاتەدا ناتوانن دڵنیا بن لە مانەوەی هەتاهەتایی خۆیان، بەڵام ئەوەی دڵنیایی بە ستەمکاران دەبەخشێ ئەو ڕاهاتنەی مرۆڤە ستەملێکراوەکانە لەگەڵ ستەمکاریدا و خوو پێوەگرتنی کۆمەڵانی خەڵکە بە ملکەچی و سەردانەواندنی خۆبەخشانە و خۆ ویستانەیە. جێی خۆیەتی لێرەدا ناونیشانی وردی نامەکەی لابۆتی بەیادی خوێنەر بهێنینەوە (***سیاسەتی ملکەچی:* گوتارێ لەبارەی خۆویستانە بوونە کۆیلە**). لابۆتی لەم نامەیەدا چەندە باسی سیاسەتی ستەمکاری و جۆری

ستەمکارانمان بۆ دەکات، ئەوەندەش باسی مرۆڤێکمان بۆ دەکات کە بە ویستی خۆی، بە عەقڵ و ئیرادە و حەزی خۆی تەسلیمی ملکەچی دەبێت. لابۆتی بە ڕستە ورد و پڕماناکانی، بە پرسیارە زیندووەکانی و بەهۆی ئەو نمونە زۆرانەی بۆ پاڵپشتیکردنی شیکردنەوەکانی دەیانهێنێتەوە و سەرجەم بەرامبەیەکی ئەدەبیی بەرز دەدەنە گوتارەکەی، سەرمان دەسووڕمێنێ لە توانای ئینسان بۆ قەبوولکردنی زۆرداری و ناپاکی و نەفس نزمی. زۆرن ئەو کەسانەی بە چێژەوە باسی ئەو شەقانە دەکەن کە لەسەرو خۆیانەوە تێیانهەڵدراوە، زۆرن ئەو کەسانەی بە تاکە نەعل لێیاندراوە و میز و پیساییان دەرخوارد داون و جوێن و قسەی نابەجێیان ئاراستەکراون و کەچی ئەوان وەك نوکتە و قسەی خۆش دەیانگێڕنەوە و پاساویان بۆ دەهێننەوە. لابۆتی بە جەختکردنەوەی لەسەر ئەو خاڵەی کە ستەمکار هیچ نییە ئەگەر ستەملێکراو هێز و وزە و دەسەڵاتی پێنەبەخشێ، ڕاستییەکی نکوڵی لێنەکراومان سەبارەت بە توانای مرۆڤ بۆ قەبوولکردنی سووکایەتی و شکاندنی عیزەتی نەفس، بۆ ئاشکرا دەکات و ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە چۆن ستەمکاران بەهۆی چاوترساندن و تۆقاندنەوە مرۆڤ لەهەموو پرنسیپێ بەتاڵ دەکەنەوە کە دەتوانێ بەهۆیەوە بەرگری لە کەرامەت و گەورەیی خۆی پێبکات. بۆیە ئەو خۆبەکۆیلەکردنە خۆبەخشانەیە و ویستی مرۆڤ بۆ سەردانەواندن لەئاست ستەمکاراندا، نەك هەر تەنیا ئەنجامی سیاسەتی ملکەچییە، بەڵکو ئەنجامێکی ئاسایی مرۆڤبوونیشە. بۆیە هەڵەیەکی گەورەیە گەر وا تێبگەین ستەمکاران بایەخ بە مرۆڤ نادەن و نایانەوێ دیراسەی ئەم بوونەوەرە بکەن، بەڵام هەوڵدانی ئەوان بۆ تێگەشتن و دۆزینەوەی خاڵە بەهێز و بایەخدارەکانی کەسێتی مرۆڤ نییە هێندەی ئەوەی بۆ دۆزینەوەی خاڵی لاوازە لە کەسایەتییەکەیدا و کوشتنی مرۆڤیاتیە لە مرۆڤدا. ڕەنگە ئەمەش وەڵامی ئەو پرسیارەمان بداتەوە کە بۆچی ستەمکاران



پشتیوانەکانی خۆیان لەناو کەسانێکدا دەستنیشاندەکەن و پێگە و دەسەڵاتیان پێدەبەخشن، کە نغرۆی خراپەکاری و گەندەڵکاری و داوێنپیسین و بۆ ساتێکیش مەبەستیان نییە مرۆڤانە هەڵسوکەوت بکەن و بژین.

خاڵێکی جەوهەری لە گوتارەکەی لابۆتیدا ئەو دەستنیشانکردنە گرنگەیەتی سەبارەت بە سوود وەرگرتنی ستەمکاران لە ئایین و جەختکردنەوەیەتی لەسەر ستەمکاری وەك ناکۆکترین شت لەبەرامبەر گەورەیی و کەرامەتی یەزداندا. وەکئەوەی لابۆتی لەو ڕێگەیەوە بیەوێ نیشانمان بدات کە هەموو وێناکردنێکی ستەمکارانەی یەزدان نەك هەر تەنیا هیچ شتێکمان لەسەر یەزدان بۆ ڕوون ناکاتەوە، بەڵکو ئەوە تەنیا جەختکردنەوەی ستەمکارانیشە لەسەر دڕندەیی خۆیان و ئەمەش بەپێچەوانەی ویستی یەزدانەوەیە، چونکە ئەو، وەك *لابۆتی* بە دڵنیاییەوە دەڵێ: لە دۆزەخدا جێگایەکی تایبەتی بۆ ستەمکاران تەرخانکردووە.

** ** **

ئەگەرچی ئەم گوتارەی *لابۆتی* لە ڕیزی دەقە گرنگەکانی فەلسەفەی سیاسی پۆلێنکراوە، بەڵام بەلای ئێمەوە دەقەکە زیاد لە پۆلێنکردنێ هەڵدەگرێ. وێڕای شێوازە ئەدەبییەکەی و ڕەوانبێژی زمانی *لابۆتی*، کە ئێمە گومانمان هەیە لەوەی توانیبێتمان بە ئەمانەتەوە بیگوێزینەوە، ئەوە بەلای ئێمەوە ئەم دەقە لاقێکی ئەوەتا لە مێژوودا، یەکێکی لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتیدا و سەری لەناو فەلسەفەی مرۆڤ و دەستێکی پەیوەستە بە ئەنترۆپۆلۆژیا و ئەوەکەی تریشی بە کۆمەڵناسییەوە. ڕەنگە ئەم خەسڵەتە کراوەیەی دەقەکەش بۆ ئێمە هۆکارێکی سەرەکی بووبێت لە سووربوونماندا لەسەر وەرگێڕانی بۆ زمانەکەمان. ئێمە لە ماوەی دووساڵ زیاتر لەگەڵ وەرگێڕانی ئەم دەقەدا ژیاوین و لە شوێنی

جۆربەجۆریش کارمان تێدا کردووە. سەرەتا لە کۆلێژی ئادابەوە دەستمان پێکرد، واتە لەو شوێنەوە کە سیمایەکی ڕوونی لەسەر هەبوونی ستەمکاری زانستی و ئیداری پێناساندین، پاشان چوینە کونجی ماڵەوە، شوێنێ کە دەبوو تیایدا چاو لە ستەمکاری بپۆشین و ستەمکاران وەك باوك و برا و میوان تەماشا بکەین، لە دوای ئەوە بەشێکیمان لە شارۆچکەی بەحرکە وەرگێڕا کە بۆخۆی وەك هەر شارۆچکەیەکی تری زۆرە ملێ لە کوردستاندا، پاشماوەیەکی دیاری ستەمکاری بەعسییەکانە. ئەمجا هەندێ ئێواران دووبەدوو دەچووینە پشت سەیتەرەکەی سەر ڕێگای شەقلاوە و لەگەڵ وەرگێڕانی هەر وشەیەکدا زیاتر لەو ڕاستییە تێدەگەیشتین کە هیچ بستێ لەم وڵاتەی ئێمەدا نەماوە دەستی ستەمکارانی نەگەیشتبێتێ.. لە کۆتایی کارەکەماندا بووین کە تێگەیشتین وا خەریکە ستەمکاری هاوڕێیەکی ئازیزمان لێ دوور دەخاتەوە و چیدی هەولێر، شارێ کە زۆرترین شەونخونیمان تیا چەشت، بۆ ئێمە هەمان مانای جارانی نامێنێ، بۆیە بڕیارماندا ئەم کتێبە پێشکەش بە کەسێ بکەین، کە فێریکردین ئاساییە مرۆڤ لە پێناوی مانەوەدا بەرگەی زوڵم بگرێ، وەلێ نابێت لەبەر هەر هۆیەك بمێنینەوە.

مراد و ڕێبوار
٢٠٠٤/٩/٢٦



## پێشەکیی وەرگێڕی فارسی

ڕەنگە ناوی *ئاتین دولابۆتی* بۆ زۆر لە خوێنەران و ئەهلی خوێندنەوە ناوێکی نەناسراو بێت. بەڵام ئەو بابەتەی کە ئەم هزرڤانەی سەدەی شازدەیەمی فەڕەنسی لەم گوتارەی خۆیدا پەرژاوەتە سەری، هەر لە دێر زەمانەوە تا ئەمڕۆ، هەمیشە جێگەی تێڕامان و ڕاڤەی خاوەن بیرورا و فەیلەسووفانی کۆمەڵایەتی بووە. دولابۆتی ساڵی ١٥٣٠ لە یەکێك لە شارەکانی خوارووی فەرەنسا لەدایك بووە. لە سەردەمی منداڵیدا دایك و باوکی خۆی لە دەستداوە و لەژێر سەرپەرشتی مامێکیدا کە قەشەیێکی کاتۆلیکی بوو پەروەدە بووە. *دولابۆتی* دوای تێپەڕاندنی قۆناغی ناوەندی لە بەشی مافدا لە زانکۆی ئۆرلیان دەستی بەخوێندن کردووە و ساڵی ١٥٥٣ لەم زانکۆیە خوێندنی تەواو کردووە. ئەم گوتارەی ئێستا، لە قۆناغی زانکۆدا، واتە ساڵی ١٥٥٠ دا نووسراوە. لەبارەی وردەکاریەکانی ژیانی دولابۆتی زانیارییەکی ئەوتۆ لەبەردەستا نیە و بەو جۆرەش کە لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ڕووندەکرێتەوە، ناوبانگی ئەو زێتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاشنایی و دۆستایەتیەی لەگەڵ میشێل دو مونتێنی دا هەیبووە.

*لابۆتی* لە دەستەی ئەو هزرڤان و بیریارانەیە بە بوێرییەکی بێوێنەوە، چوارچێوەکانی هزری سەردەمی خۆی تێکدەشکێنێ و سنوورەکانی سەردەمی خۆی دەبەزێنێت؛ هەر لەبەر ئەم هۆیەش هزر و بیرە سیاسیەکانی نزیکەی سەدەیەك دوای گوتارەکەی، لە شۆڕشی فەرەنسادا

جێی خۆیان دەگرن و دواتریش دەچنە ڕیزی بەرهەمە هزرییە سەردەمسازەکانەوە.

فەرەنسای سەدەی شازدەیەم لە منداڵدانی ڕێنیسانسی ئەوروپادا، هەورەکو ئیتالیا، ئەلمانیا و ئینگلتەرا لە هەڵبەز و دابەزێکی قەیراناویدا ڕۆیشتنی بەرەو دنیای هاوچەرخ ئەزموونده‌کرد. دنیایەك کە مرۆڤ تیایدا خۆی لە کۆت و پێوەندەکان رزگارکردبوو؛ لە چەقی بوونی کۆمەڵایەتیدا جێی خۆی دەکردەوە و بەدوای گەشەی هزری، فەلسەفی، ئەدەبی و هونەری خۆیدا هەنگاوی دەنا. لەم چوارچێویەدا سەرەتاکانی سەرهەڵدانی راپەڕینە کۆمەڵایەتیە رزگاریخوازەکان، بەرەودان بە ئازادیخوازی، لیبرالیزم، هەروەها دیمۆکراسی وردەوردە پێدەگەیشت. سەرەتای سەدەی ئەقڵێنیەت، دژایەتی و ناکوکی نێوان هێزە پێشڕەوەکان و هۆکارە کۆن و پارێزگارەکان، چاکسازییە ئاینیەکان، لە لایەن *لۆتەر* و *ژان کالڤینەوە*، هزرە بێ نموونە و بێ بەدیلەکانی ئاراسمۆس، ویلیام ئاکمی و کێشە ئایینزاییەکانی نێوان کاتۆلیك و پروتستانەکان، فرەوانبوونی رۆژ لە دوای رۆژی کەلێنی نێوان دەوڵەت و کەنیسەو...، هەموویان زەمینەی تێپەڕینیان لە سەدەکانی ناڤین بەرەو سەدەی ڕێنیسانس دەرەخساند و تۆوی گەورەترین شۆڕشی مێژوویی ئەوروپای لەخۆیاندا هەڵدەگرت. لەم هەلومەرج و بارودۆخەدا بوو کە لابۆتی لاو گوتارە بێ وێنەکەی خۆی نووسی.

*لابۆتی* لە گوتاری خۆبەکۆیلەکردندا بە تێڕوانینێکی قووڵ و بە هزرێکەوە کە لە سەردەمی خۆی تێدەپەڕاند، بۆ یەکەمجار دەکەوێتە لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە لەبارەی جەوهەری ستەمکاری و چۆنیەتی دروستبوونی، سەقامگیربوون و بەردەوامی دەوڵەتە ستەمکارەکان، ئەویش بەخستنەڕووی ئەو پرسیارانەی کە هێشتاکەش وەڵامی پراکتیکیان نەدراوەتەوە، فەلسەفەیەکی سیاسی نوێ دادەرێژێت.



ئەو یەکەمین هزرڤانێکە کە بە پشت بەستن بە نموونەی زۆری ستەمکاران بەتایبەتی زۆردارەکانی سەردەمە کۆنەکان، کە بەبڕوای ئەو دانەی دیکەی دووبارەبوونەوەی حکومەتە دیکاتۆریەکانی رۆژگاری هاوچەرخن، هۆی بەردەوامی زۆرداری بەدرێژایی نەوە یەك لەدوای یەکەکان روونکردەوە و بۆ لەناوبردنی ستەمکاری، ڕێگایەکی پراکتیکی پێشنیار کردوە. هەر ئەم خاڵەی کۆتایشە کە رەهەندێکی گەشاوە و سیمایەکی بێ وێنە دەداتە گوتارەکەی لە بەراوردکردنیدا بەهزرڤانانی سەردەمی خۆی.

هەروەکو لە ناوی گوتارەکەیدا دیارە، ئەو کلیلی تێگەیشتن لە ستەمکاری لەو هەڵبژاردنە خۆبەخشانەیەی خەڵکدا دەبینێتەوە، و پێی دەڵێ خۆبەکۆیلەکردن و لە سەرتاسەری گوتارەکەیدا جەخت لەو ڕاستیە دەکاتەوە کە «دەوڵەتی ستەمکار» شتێك نیە جگە لەو دەسەڵاتەی کە ئاپۆرەی خەڵك بەمەیل و رەزامەندی خۆیان بە کەسی فەرمانڕەوا دەیبەخشێت و ((ستەمکار)) جگە لە ملکەچی و خۆزەلیلکردنی خۆبەخشانەی کۆمەڵانی خەڵك پێگەیەکی دیکەی نیە. لە ڕاستیدا، لابۆتی زۆرینەی هەرە زۆری ئاپۆرەی خەڵك بە گەورەترین پشت و پەنای ستەمکاری دەناسێنێ.

ئەو پرسیارانەی کە *لابۆتی* خستونیەتە ڕوو، پرسیارگەلێکی ئاسان و چێژبەخشن. ئەو دەپرسێ: «بۆچی هەزاران و ملیۆنان کەس ملکەچ دەکەن بۆ ستەمی چەوسێنەر و بەدرێژەدان بە گوێڕایەڵی و گواستنەوەی "گوێڕایەڵیکردن" بۆ نەوەکانی داهاتوو بەردەوامی ئەو زامن دەکەن؟» و پاشان وەڵامگەلێکی بێ جێگرەوەمان لە بەرامبەردا قوت دەکاتەوە کە زێتر لە هەر شتێ، ... بونیادەکانی دەروونناسی «خۆبەدەستەوەدان و هەڵکردن» لەگەڵ ستەمکاریدا شیدەکاتەوە. لابۆتی رووبەڕووی ژمارەیەکی زۆر لە خۆبەکۆیلەکردووەکان هاوار دەکات لەجیاتی گوێڕایەڵی، هەڵکردن و

هەدادان، واز لە قەبوولکردنی ملکەچی بهێنن؛ پشتگیری ستەمکار مەکەن، بۆ یەك ساتەوەخت، داوای ئازادی بکەن، چونکە ئازادی مافێکی سروشتی و زگماکە. ئەوکاتە دەبینی کە کۆڵەکەکانی ستەمکاری دەروخێن››.

ستراتیژیەتی پێشنیارکراوی *لابۆتی*، بەپشت بەستن بە ‹‹سەرپێچیکردنی مەدەنی››، زەبرەهێزی (بالقوە) ئاپۆرەکانی خەڵك بەبێ پێویستیکردن بەزەبروزەنگ و خوێنڕێژی، بە ئاراستەی لەناوبردنی ستەمکاری ڕێك دەخات. ئەو کۆمەڵانی خەڵك داوەت ناکات بۆ سەرهەڵدان و ڕاپەرین، بەڵکو داوایان لێدەکات بۆ جۆرێك لە خەباتی نێگەتیڤ.

بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین لە مێژووی هزری سیاسیدا کەمن ئەو بیریارانەی کە وەك *لابۆتی* تەنیا بەراڤەکردن و شرۆڤەکردنی ستەمکاری وازیان نەهێناوەو، بۆ لەناوبردنی، ستراتیژیەتێکی کردەیی و پراکتیکییان خستووتەڕوو. ئەو لە ڕوونکردنەوەی سەرچاوەی ستەمکاری دا بە وردبینیەکی بێنموونەوە بەدوای ئەو هۆکارە وردانەدا دەگەڕێت کە لە بەرهەمهێنان و پتەوکردنی کۆڵەگەکانی دەوڵەتی رەهادا رۆڵێکی دەستنیشانکەریان هەیە؛ هۆکارگەلێکی وەك خوو، نەریت، بیروڕاو هەڵە بەدەستهێنراوەکان. هزرڤانانی کۆمەڵایەتی پێش لابۆتی، تەنانەت هاوچەرخەکانی ئەویش لە بیروڕای سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆیاندا ئەم خاڵە وردەیان لە بیرچووە و لەنێو ئەواندا تەنیا ‹‹*مارکس*›› دوو سەدە دوای لابۆتی لە هزری سیاسی خۆیدا ئاماژەی بە رۆڵی هێزی خوو لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا کردووە.

*لابۆتی* تابلۆیەك لە کۆمەڵە مرۆییەکان دەکێشێت کە تیایدا، زۆربەی زۆری خەڵك بەبێ کەمترین ئاگاداری لەمەڕ مافە مرۆیی و سروشتیەکانی خۆیان، ستەمکاری و کۆیلایەتی سیاسیان قەبووڵ کردووە و بەتاکە شێوەیەکی خوازراو یاخود نکوڵی لێنەکراوی دەزانن؛ لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لە رۆڵ و گرنگی هەرچەند کەمی رۆشنبیرانی ئازادیخواز و سەربژاردەکانی



کۆمەڵگاش بێ ئاگا نیە. ئەو دەنووسێ: ‹‹بەردەوام ژمارەیەك لە تاکەکان هەن کە لە ئەوانی دیکە زاناترن و هەست بە قورسایی کۆت و زنجیر دەکەن. ئەم کەسانە هەرگیز کۆیلەتیان پێ قەبووڵ ناکرێت و بەردەوام لەناکوکیدان لەگەڵیدا ...›› لەبنەڕەتدا، مەبەستی *لابۆتی* لە ‹‹زانایان›› ئەو رۆشنبیرانەن کە لە مێژووی خەباتی کۆمەڵایەتیدا هەمیشە دەستپێشخەر بوون و هەرچەند لە سەردەمی ئەودا ئەم دەستە کۆمەڵایەتیە هێشتا بە شێوەی چینێکی سەربەست و سەربەخۆ دەرنەکەوتبوو، بەڵام ئەو شوێنگە و رۆڵەی کە *لابۆتی* بۆ ئەم دەستەیە لەبەرچاوی گرتبوو لە سەردەمەکانی داهاتوودا و هەروەها لە جیهانی نوێدا بەدروستی دەسەلمێت.

جیاوگی هزری *لابۆتی* لە تیۆری سیاسی ئەودا لەوێدا دەردەکەوێت کە نەك تەنیا دژایەتی پاشایەتی دەکات بەڵکو چەوساندنەوەی زۆرینە و دەوڵەتسالاریش رەتدەکاتەوە: ‹‹گوێڕایەڵی کردن لە چەندین گەورە چەندەین جار شوومترە›› ئەو ستەمکاران بە چاوپۆشی لەلایەنە هاوبەشەکانیان دابەش دەکاتە سەر سێ دەستەی هەڵبژێردراو، میراتگر و تۆتالیتار پاشان هۆکار و فاکتەرەکانی دروستبوونی هەریەك لەم سێ جۆرە چەوسێنەرە بەدووردرێژی روون دەکاتەوە. زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین *لابۆتی* لە رەچەڵەکناسی و روونکردنەوەی ستەمکاری و پەیوەندی نێوان فەرمانڕەوایان و فەرمانبەراندا و هەروەها گوتە سەرەکیەکانی تیۆری سیاسی مۆدێرن، هیچ خاڵێکی لەبیرنەکردووە؛ گشتمەندی و سەرتاپاگیری گوتارەکەی، ئەوی خستۆتە ریزی تیۆریستانی مۆدێرنەوە.

ئەم کتێبە لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم پێشەکیەکە بە قەڵەمی *ماری ئێن روتبار*، مامۆستای ئابووری کۆلێژی پولی تەکنیکی نیۆریۆرك. لەم پێشەکیەدا، روتبار هزری سیاسی *لابۆتی* بەتێروتەسەلی شیدەکاتەوە و کورتەیەك لە هەلومەرجە بابەتی و زەینیەکانی سەردەمی ئەو دەخاتەڕوو. بەشی دووەم، دەقی گوتارەکەیە لە سێ بەش

پێکهاتووە کە ناونیشانی هەر بەشێك لە پێرستەکەدا بەشێوەیەکی دووروودرێژ باسکراوە. بەهۆی جۆر بەجۆری ناوە تایبەتیە مێژووییەکان، جگە لە روونکردنەوەکانی کۆتایی هەربەشێك کە بەپێی ژمارەی پەراوێزبەندییەوە دەستنیشان کراون، وەرگێڕیش لەبارەی هەندێ ناو و زاراوە کە بە پێویستی زانیون لە پەراوێزدا روونکردنەوەی پێشکەش کردووە.

**عەلی مەعنەوی**

**بەهاری ١٩٩٩**



## هزرە سیاسییەکانی ئاتین دولابۆتی

*ئاتین دولابۆتی*(١) بەر لە هەر شتێك بەهۆی هاوڕێیەتی و هاودەمی نزیکی لەگەڵ وتارنووسی بەناوبانگی فەرەنسی *میشێل دو مۆنتێنی*[١] دا ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام هەر وەك زۆربەی مێژوونووسان دانیان پێداناوە دەتوانین ئەو بە یەکێك لە دەستەی سەردەمسازترین فەیلەسووفانی سیاسی لەقەڵەم بدەین کە لەبەر گشتمەندی، فرەوانی و نەمری تیۆرییەکانیەوە، نەك تەنیا بە بناغەدانەری فەلسەفەی سیاسی فەرەنسا، بەڵکو بەهی جیهان دەژمێردرێت.

*ئاتین دولابۆتی* ساڵی ١٥٣٠ لە شاری سارلات (sarlat) ناوچەی پریگۆر (perigord)، لە ناوچەکانی خۆرئاوای فەرەنسا لە بنەماڵەیەکی ئەرستوکراتی لەدایك بووە. باوکی یەکێك بووە لە کاربەدەستە دەربارییەکانی ناوچەی پریگۆر و دایکیشی خوشکی سەرۆکی پەرلمانی بۆردو[٢] واتە ئەنجومەنی مافناسان بوو. ئاتین زۆر زوو دایك و باوکی خۆی لەدەست داو لەژێر سەرپەرشتی مامی خۆیدا کە قەشەیەك بوو، پەروەردە بوو، ساڵی ١٥٥٣ بەشی مافی لە زانکۆی ئورلیان تەواوکردوو ساڵێك دواتر، بەهۆی زیرەکی بێ وێنە و ئەو توانا جێ سەرنجەی کە لە خۆیدا پیشاندا

---

١ Michel de montainge(١٥٣٢ــ١٥٩٢)، نووسەرێکی فەرەنسیە، کتێبی وتارەکان ( Les Essais)ی ئەو لە شاکارەکانی ئەدەبی فەرەنسیە وکاریگەریەکی زۆری لەسەر ئەدەبی ئەوروپا هەبووە.

٢ Bordeaux پایتەختی کۆنی گوین (Guyenne)، کورسیی دیپارتومانی ژیرۆند، لەکەناری گارۆن.

وێڕای کەم تەمەنی پایەیەکی گرنگی لە پەرلەمانی بۆردۆ پێ سپێردرا. ئاتین تا ساتەوەختی مەرگ، واتە تا ساڵی ١٥٦٣ کە ٣٢ ساڵان بوو، لەم پەرلەمانەدا لە پێگەی دادوەر و ڕاوێژکاری دیپلۆماتی سەرگەرمی کارکردن بوو. ئەو هەروەك شاعیرێکی خۆش سەلیقە و مرۆڤدۆست بوو بەرهەمگەلێکی گێزنەفون[١] و پلوتارك[٢] ـ یشی وەرگێڕا بوو و پەیوەندی توندیشی لەگەڵ گروپێکی لاو و پێشکەوتووی شاعیران بە ناوی پلیاد[٣]

---

١ Xenophon، مێژوونووس، فەیلەسووف، و سەرکردەی ئەسینی (نزیکەی ٤٣٠ــ٣٥٥ پ.ز)، ئەو لەگەنجێتی خۆیدا قوتابی سوکرات و لە ساڵی ٤٠١ پ.زژ هاوشان لەگەڵ هاوڕێیەکەی proxenos، خزمەتکردنی کورۆشی بچووك ـ کوڕی داریۆشی دووەم، پاشای ئێران ـ ی پەسەند کرد و بە یارمەتی ئەو، لەدژی ئەردەشێری دووەم، شای هخامەنشی جەنگا، بەڵام کوروشی بچووك تێکشکا و کوژرا. لە دوای ئەو شکستە، گەزنەفۆن دە هەزار سواری سپارتایی لە ڕێگەی ئاسیای بچووکەوە گەڕاندنەوە یۆنان و چیرۆکەکەی لە کتێبی گەڕانەوەی دەهەزار کەسدا نووسراوە. دوای ماوەیەك لەگەڵ پاشای سپارتا یەکی گرت و هێرشی کردە سەر یۆنان. گرنگترین بەرهەمەکانی ئەو بریتین لە، گەڕانەوەی دە هەزار کەس، ئاناباز، پەروەردەی کورۆش، مێژووی یۆنان، چەند سەرنجێك لەبارەی حکومەتی سپارتا، و ئەسینا و سوکرات.

٢ Plutarch یاخود پلوتارخس، فەیلەسووف و مێژوونووسی یۆنانی (لەنێوان ٤٥ تا ٥٠ ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو زانستی سەردەمی لە ئەسینا خوێند، بوو بە پەیڕەوی فەلسەفەی ئەفلاتوون، سەفەری میسر و ئیتالیای کرد و زۆر کتێبی نووسی کە کراون بە دووبەش ١ـ سەرگوزشتەی پیاوەکان کە بەزۆری یۆنانی و ڕۆمی بوون و هەندێکیش ئێرانی (تمیستۆکلس، ئاژزیلاس، ئەسکەندەر، ئەردەشێر). ٢ــ پۆلینە فەلسەفیەکانی کە زۆرتر لەبارەی ئەخلاقەوەن.

٣ Pleiade، گروپێکە و لە حەوت شاعیری فەڕەنسی سەدەی شانزدە پێکدەهات، کەناوی ((پلیاد)) یان لە پلیادەکان، حەوت خوشکە ئەفسانەییەکان وەرگرتبوو کە بەپێگەی خوایی گەیشتبوون و شێوەی فەلەکی ((پەروین)) یان پێکدەهێنا کە بریتیبوو لە حەوت ئەستێرە. پیر روسنار ڕێبەری ئەم گروپە بوو ئامانجی ئەوان بریتی بوو لە گۆڕینی زمانی شیعری فەرەنسی و سەربەخۆبوونی بوو لە زمانی کلاسیکی لاتینی.



هەبوو کە لەو گروپەدا شاعیرگەلێکیوەك ڕۆسنار، *ژان دۆرا* و *ئەنتوان دوبائیف* چالاکیان دەنواند، بەبایەخترین هزرە سیاسییەکانی لابۆتی لە کاتێکدا خرانە سەر کاغەز کە ئەو قوتابی زانکۆی ئورلیان بوو، چونکە لەم زانکۆیەدا کەشی لێکۆڵینەوە و شرۆڤەکردن باڵا دەست بوو و لابۆتی روحیەتە عەودالْ و لێکۆڵەرەوەکەی لە سەردەمی خوێندندا گەیاندە دوایین پلەی پێگەیشتنی خۆی. زانکۆی ئورلیان لەو رۆژگارەدا، کە رۆژگاری گفتوگۆ و مشتومڕی ئاییینی بوو گۆڕا بۆ سەنتەری گفتوگو و باسی ئازادانە.

یەکێك لە مامۆستاکانی زانکۆی ئورلیان، کە زێترین کاریگەری لە سەر لابۆتی هەبووە، مامۆستایەکی پێشکەوتنخواز و پڕجۆش بوو بەناوی *ئان دوبورگ* کە دواتر لە ساڵی ١٥٥٩ بەتاوانی بیدعەکردن سوتێنرا و بەیەکێك لە شەهیدەکانی هوگنۆکان[١] دەژمێردرێت. *دوبورگ* لەو کاتەدا هێشتا

---

١ Huguenot، پرۆستانتە فەڕەنسیەکان، مێژوونووسان بەزۆری باس لە چوار جەنگی ناوخۆیی لە فەڕەنسای نیوەی دووەمی سەدەی شانزدە دەکەن، بەڵام بەکردەوە لەساڵی ١٥٦٤ [ مێژووی کوشتاری ڤاسی (vassy) وشەڕی درو (Dreux) تاکو ساڵی ١٥٩٥ (ئەوکاتەی پاپا، لە هێزی چوارەم خوشبوو) شەڕ بەبێ ڕاوەستان بەردەوام بوو. مێژوونووسان ئەم شەڕانەیان بە ((شەڕە ئایینیەکان)) ناو بردووە کە لەلایەکەوە، کاتولیکەکان بوون لە لایەکی تر، پەیڕەوانی کالڤن، کە ئەوانیان بە ((هوگنۆکان ئەو پیاو و ((ژنی)) گەورەکان، مافناسان، بازرگان و پیشەکارەکان بوون بەتایبەتی لە شارەکان باشور، لەوانەش بۆردو دەسەڵاتیان هەبوو. کاترین دو مدیتچی (catherin de medici) نوێنەری پاشایەتی حکومەت، ئیمتیازێکی بە هونگنوکان بەخشی و لە ئەنجامدا ئەوان ساڵی ١٥٦٢ بەهرەمەندبوون لە ئازادی پەرستن. هەمان ئەوەی کە هوگنوکان بەهێزتربوون، حکومەت شێوازێکی دیکەی گرتەبەر. کوشتاری بەناوبانگی سەن بارتۆلمی لە ساڵی ١٥٧٢ لەگەڵ پیلانێکی کاترین دو میدیتچی بۆ کوشتنی رابەری هوگنوکان دەستی پێکرد و لەماوەیەکی کەمدا، ئەم کوشتارە بۆ شارەکانی لیۆن، تۆلۆز، بۆردو و شوێنەکانی دیکە دزەی کرد.

نەچوو بووە سەر ڕێبازی پروتستانتەکان، بەڵام مەیلی بۆ ئەو دەستەیە دروست ببوو. بێ هۆ نیە کە زانکۆی ئورلیان دواتر بووە ناوەندی کالڤینیزم[1] و بەشێك لە هاوپۆلەکانی *لابۆتی* بوونە ڕابەرانی ئایندەی هوگنۆ...؛ کە یەکێك لەوانەش *لامبەردنو* واتە دڵسوزترین هاوڕێی *لابۆتی* و لە هەمان کاتیشدا خۆشەویسترین قوتابی دوبورگ بوو. لەو سەردەمەدا خوێندن لە بەشی مافدا هاوشان بوو بە تۆژینەوەی فەلسەفی لەپێناوی دۆزینەوەی ڕاستی و بنەما ڕیشەییەکان یەکێك بوو لە سەرنجڕاکێشترین کارەکان. *پول بۆینفۆن* لە سەدەی شانزدەیەمدا دەنووسێت: ((خوێندنی ماف زێتر لەوەی کە خوێندنێکی ئاسایی بێت، جۆرێك بوو لە هەوڵدان لەپێناو دۆزینەوەی ڕاستیدا و ئاسۆیەکی بێ کۆتایی بۆ ڕامانی فەلسەفی لە بەرامبەر قوتابیدا دەکردەوە.))(٢) قوتابخانەکانی ماف کە پابەندبوون بەزانکۆی ئورلیان و هەروەها زانکۆ پڕئیعتبارەکانی تر ئەو فەزایەیان هەبوو کە *کالڤین* بۆ خۆی دوو دەیە پێشتر لەمەڕ چاکسازی ئاینی پروتستانتەکان کەوتبووە بانگەشەکردن و بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی خۆی (٣) هەروەها لە کەشێکی ئەوتۆشدا بوو کە پارێزەر و مافناسانی فەڕەنسی یەکێك لە گرنگرین ناوەندەکانی دەسەڵاتی کالڤینیزستەکانیان پێکدەهێنا.

لە سەردەمی پڕ هەڵبەز و دابەزی خوێندنی زانکۆی ئورلیان *ئاتێن دولابۆتی* نامەی خۆبەکۆیلەکردنی هێنایە سەرکاغەز (٤) لابۆتی ئەم

---

[1] ژان کالڤن، پێشەوای ڕاپەڕینی ئایینی و ڕیفۆرمخوازی فەڕەنسا، ئەو موژدە بەخشی بنەماکانی بیروباوەڕی ((ڕیفۆرم)) لە فەڕەنسا و سویسرا بوو. کالڤن دامەزرێنەری تایفەیەکە کە خۆی بەکالڤینیزم ناوی ناوە. ئەندامانی ئەو تایفەیە کە لەپروتستانتەکان دەژمێردرێن، خاوەن ڕوحیەتێکی دیمۆکراتیانەو جیاواز لە هەموو ڕێوڕەسمە ئایینیە باوەکانن لە مەزهەبی کاتولیکەکاندا.



نامەیەی بەشێوەی دەستنووس بڵاوکردەوە و هەرگیز هەوڵی چاپکردنی نەدا. دەتوانین هەست بەوە بکەین کە هۆکاری خۆدوورگرتنی نووسەر لەوەی کە نامەکەی بڵاو بکاتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بۆچوونە زیادەڕەوانەی لە نامەکەدا هەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا نامەی ناوبراو لەناو دەستە و تاقمی ڕۆشنبیرانی ناوچەی پریگور ناوبانگێکی شیاوی بەدەست هێنا. ئەم خاڵەمان لەوێوە بۆ دەردەکەوێت کە مۆنتنی سەردەمانێك پێش ئەوەی بۆ یەکەمجار چاوی بە لابۆتی بکەوێت (کە ئەوکات ئەندامی پەرلەمانی بۆردۆ بوو) ئەو نامەیەی خوێندبووەوە.

یەکەمین خاڵی سەرنجڕاکێش لەو نامەیەدا، شێوە و چوراچێوەکەیەتی. *لابۆتی* میتۆدێکی تیۆری، ئەبستراکت و پابەند بەقیاسی بەکارهێناوە کە ڕێك و ڕاست خاڵی بەرامبەری میتۆدی نووسەرانی *مۆگنۆیە* کە لە دەیەکانی ١٥٧٠ و ١٥٨٠ بابەتە مێژوویی و یاساییەکانیان بەتێڕوانینێکی زۆر وردەوە دەخستەڕوو (مەبەستمان ئەو کۆمەڵە نووسەرە گروپخوازانەی کە باسی ئەوان بەمجۆرە بوو: تابیعەکان مافی ئەوەیان هەیە لە بەرامبەر فەرمانڕەوا، زۆردار و نادادپەروەرەکاندا بەرگری بکەن) و لابۆتی لە دەرخستنی دژایەتی خۆی لەگەڵ حکومەتی زۆر و ستەمدا هاوشێوەی *مۆگنۆکان* بوو. باشترین بەڵگەی *مۆگنۆکان* کتێبی Franco- Gallia (١٥٧٣) بەرهەمی فرانسوا هوتمانە. بابەتەکانی ئەم کتێبە زێتر لەسەر پێشینەی مێژوویی، واقعی یان گریمانەکراوی یاسا، و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی فەرەنسا چەقی بەستووە، وەلێ تەنیا نموونە مێژووییەکان، کە *لابۆتی* لە نامەکەیدا ئاماژەیان پێ دەکات، هەموویان لە سەردەمانی ڕابردوو و تەوراتەوە وەرگیراون و لەگەڵ تایبەتمەندی سەرووکاتیبوونی نامەکەدا تێکهەڵکێش کراون. بابەتەکانی لەوەو دوای *مۆگنۆکان* لەدژی ستەمکاری سنووردارتر و تایبەتمەندیتر دەبن و

زۆربەشیان لەسەر بنەمای دامەزراوە واقیعەکانی وڵاتی فەرەنسا بوون. لە کۆتایشدا ئەنجامگیریەکان و خوێندنەوەکانی ئەو بابەتانە لەپێناوی بەرزکردنەوەی ئازادییە تایبەتیەکان لە بەرامبەر سیستەمی جێگرتوو لە کۆمەڵگای ئەو سەردەمەی فەرەنسادا بەس نەبوو.

لە بەرامبەر ئەمەدا هەمان ئەو ئەبستراکیەت و گشتمەندییەی هزری *لابۆتی* لەمەڕ جەوهەری ستەمکاری، ئازادی خەڵك و ئەوەی کە دەبێت لەپێناو رەتکردنەوەی ڕابردوو و سەقامیگری ئایندەدا بەدەست بهێنرێ، بەئەنجامگەلێك کۆتایی هات کە توند و زێدەڕۆیانە وەلێ گشتگرەوە بوون.

*لابۆتی* لە بەڵگەهێناوە ئەبستراکت و گشتمەندەکاندا، لە روونکردنەوەی فەلسەفەی سیاسی ڕاستەقینە هەروەها پشت بەستنە بەردەوامی خۆیدا بە تەورات و سەردەمی کلاسیك، پەیڕەوی شێوەی نووسەرانی رێنیسانس بە تایبەتیش نیکولا *ماکیاڤیللی*[1] کردووە. هەڵبەت لەنێوان ئەو و *ماکیاڤیلیدا* جیاوازییەکی هەستپێکراو هەیە: *ماکیاڤیللی* لەو بڕوایەدابوو کە کۆڵەگەکانی دەسەڵاتی «میر» بە سوود وەرگرتن لە یاساکانی خودی خۆی پتەوبکات، لە کاتێکدا کە لابۆتی رێگاگەلێکی لە پێناو سەرنگون کردنی میر و پاراستنی ئازادی تاکەکەس دەگرتەبەر. لەسەر بنچینەی ئەم خاڵەوەیە کە *ئەمیل بەریێ*، لە نێوان ریالیزمی نەرێگەرای *ماکیاڤیللی* و ئایدیالیزمی یاسایی *لابۆتی* رووبەڕووبوونەوە و دژایەتی دەبینێت.(٥) هەڵبەت جەخت کردنەوەی لابۆتی لەسەر ئەقڵیەتی پەتی و مافی تەواوی تاکەکەسی لە تایبەتمەندیەکانی هزری سیاسی سەدەی هەژدەیە. جی. *دەبلیۆ ئالن* دەنووسێت:

نامەکەی *لابۆتی* «گوتارێکە لەبارەی ئازادی، یەکسانی و برایەتی سروشتییانەی مرۆڤەکان» گوتاری ئەم هزرڤانە، پاساو بۆ ئەو واقعیەتەی لەلایەن هۆگنۆییەکانەوە گرنگی پێدەدرا دەهێنێتەوە کە یاسای سروشتی و مافی سروشتیانەی خەڵك، بەرەنگاربوونەوەی توڕەی ئەوانە لە بەرامبەر دەوڵەتی چەوساندنەوە و ستەمدا. *ئالن* درێژەی پێدەدات: «بەڵام سوود وەرگرتن لە زمانی مافی سروشتی و رەها، خۆی لە خۆیدا خزمەتی بەهیچ یەکێك لە ئامانجەکانی هۆگنۆکانی فەرەنسا نەکرد. لە ڕاستیدا، ئەم زمانە هەرگیز لە هیچ سەردەمێکدا نەیتوانی ئەو ئامانجانەی کە خۆی خستبۆینە ڕوو بهێنێتە دی، بەڵام رەنگە لە ئایندەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.»(٦) لەشوێنێکیشدا هارۆڵد لاسکی[1] بەشێوەیەکی بنەبڕ و ڕاشکاوانە دەڵێت «ئەو مافە گشتیەی کە هاوڕێیەکەی *مونتنی* (مەبەستی لابۆتی یە. و) وەسفی دەکات، لە ڕاستیدا، هەمان ئەندازە لە روحی سەردەمەوە دوورە کە بەڕەڵایی هێربەرت سپنسەر[2] سەبارەت بەدەوڵەت و

---

[1] Nicolo Machiavelli (١٤٦٩ـ١٥٢٧)، مێژووناس و سیاسەتمەداری ئیتالی، ئەو لە خزمەتکردنی وڵاتدا، قوربانیدانێکی زۆری لە خۆپیشاندا و بەرهەمگەلێکی بەناوبانگی لە پاش خۆی بەجێ هێشتن کە بریتین لە: تیتلیۆ، هونەری شەڕ و میر" ماکیاڤیللی لە کاروبارە سیاسیەکاندا لەو بڕوایەدا بوو کە دەبێت تەنیا، گەیشتن بە ئامانج لەبەرچاو بگرین و پێویست ناکات لەم بارەوە رەچاوی بنەما ئەخلاقیەکان بکەین. رێبازەکەی بە ماکیاڤیللیزم بەناوبانگە.



---

[1] Harold Laski (١٨٩٣ـ ١٩٥٠) زانا و بیریاری سیاسی ئینگلیز، ئەو لە ئەندامە چالاکەکانی حزبی کرێکاران و ئەنجومەنی فابیانەکان بوو. بەرهەمە بەناوبانگەکانی بریتین لە: رێسای سیاسەت، دەوڵەت لە تیۆر و کردەوەدا، سەرهەڵدانی لیبرالیزمی ئەوروپی، وەڵامەکانی شۆڕشی سەردەمی ئێمە.

[2] Herbert spencer (١٨٢٠ـ١٩٠٣)، فەیلەسووفی بەناوبانگی ئینگلیز، دانەری تیۆری سەرەتای پەرەسەندن کە دواتر لە لایەن داروینەوە نووسرا. بەرهەمە بەناوبانگەکانی بریتین لە: ستاتیکاناسی

رەتکردنەوەی خۆتێهەڵقورتاندنی دەوڵەت، لە واقعیەتی ئەو سەردەمە دووربوو.» (٧)

*ولیەم ئێف* چورچ جەخت دەکاتە سەر دوالیزمێك، کە بەبڕوای ئەو دوالیزمێکە لە نێوان تێڕوانینی لابۆتی کە باس لە تێزە یەکەمەکانی مافی سروشتی لە سەدەی هەژدە و تێڕوانینە مێژوویی و یاسامەندەکانی نووسەرانی *مۆگنۆ* دەکات کە سوودیان لە نامەکەی ئەو وەرگرتووە. چورچ دەنووسێت: «لە بەرامبەر ئاراستەی مافگەرایانە کە بەسەر هزر و تێڕوانینی سەدەی شانزدەی فەرەنسادا زاڵ بوو، نامەگەلێکی تەواو تیۆری کە یەکێکن لە تایبەتمەندییەکانی سەدەی هەژدە، هەرچەندە زۆریش کەم بوون، بەڵام بەتوندی ناکوك بوون لەگەڵ روحی سەردەمی خۆیاندا.»
چورچ دواتر نامەکەی لابۆتی لە ڕیزی ئەو نووسینانەدا دادەنێت.(٨)

نامەی خۆبەکۆیلەکردن بەشێوەیەکی دیار دەربڕی تێڕوانینێکی ورد و هوشیارانەیە سەبارەت بەچیەتی ستەمکاری و بونیادی دەوڵەت وەك دامەزراوێك. زۆربەی نووسەرانی سەدەی ناوەڕاست لە نووسین و بەرهەمەکانی خۆیاندا رەخنەیان لە ستەمکاری گرتووە، بەڵام لابۆتی هەنگاوێك زێتر دەچێتە پێش و لە جەوهەری ستەمکاری و بەتایبەتی لە ماهیەتی دەوڵەت دەکۆڵێتەوە. کورتەی تێڕوانینی *لابۆتی* ئەوەیە کە هەموو دەوڵەتێکی ستەمکار بەپێی ویست و رەزامەندی گشتی خەڵك دروست بووە. بە مانایەکی تر، خەڵك ـ لەبەر هەندێ هۆ ـ ملکەچی لە ئاست کۆیلەبوون و بەندایەتی دا دەنوێنن؛ و ئەگەر بەو جۆرە نەدەبوو، هیچ جۆرە چەوساندنەوە یاخود لەبنەڕەتدا دەوڵەتێکی ستەمکار هێندە

---

کۆمەڵایەتی، سیستەمی فەلسەفەی پێکهاتەیی، بونیادەکانی کۆمەڵناسی، دادپەروەری، مرۆڤ لەبەرامبەر دەوڵەتدا.



بەردەوام نەدەبوو. کەواتە، بۆ ئەوەی دەوڵەتێك لەلایەن عامەی خەڵکەوە پارێزگاری لێ بکرێت، لەبنەڕەتدا پێویست نیە لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرابێ؛ چونکە ئاپۆرەکانی خەڵك تەنانەت پارێزگاری لەچەوسێنەرترین ستەمکارەکانیش دەکەن؛ کەوابێ فەرمانبەرەکان بۆ خۆیان بەپێی رەزامەندی تایبەتیان مل بۆ فەرمانڕەواکان کەچ دەکەن. (٩) کەواتە بە بڕوای *لابۆتی* پرسیاری سەرەکی و تەوەری لە تیۆری سیاسیدا ئەوەیە کە بۆچی خەڵکی جیهان لە ئاست کۆت و پێوەند و کۆیلایەتیدا ملکەچ دەبن؟ بەختستنەڕووی ئەم پرسیارە، *لابۆتی* لە چەقی فەلسەفەی سیاسیدا ڕێگایەکی نوێ دەکاتەوە، واتە رازی گوێڕایەڵی مەدەنی چییە؟

بوچی خەڵك لە هەموو شوێن و کاتەکاندا ملکەچی لە ئاست فەرمان و یاساکانی حکومەتێکدا، کە کەمایەتییەکی بچووك پێکدەهێنن پیشاندەدەن؟ بەبۆچوونی *لابۆتی* روانگەی «پرسپێکتیڤ» ملکەچی گشتی لە بەرامبەر دەوڵەتە ستەمکارەکاندا، روانگەیەکی شێواو و نائومێدکەرە:

> **تەنیا دەمەوێ بزانم چۆنە کە ئاپۆرەیەك لە مرۆڤەکان، گوندەکان، شارەکان و نەتەوەکان لەژێر باری زۆر و ستەمی زۆردارێکدا ئازار دەکێشن کە هیچ دەسەڵاتێکی نییە جگە لەو دەسەڵاتەی کە خودی خەڵك پێیان بەخشیوە؛ زۆردارێك کە توانای هەیە تەنیا تا ئەو شوێنە ئازاریان بدات کە توانای بەرگەگرتنیان هەیە؛ ستەمکارێك کە بەهۆی هەدادانی خەڵك و حەزنەکردنیان لە دژایەتیکردن، بواری ئەوەی بۆ دەڕەخسێت کە هەموو زیانێك بە خەڵك بگەیەنێت و هەر ستەمێك کە بخوازێ بۆ ئەوانی بەڕەوا بزانێت. بێگومان ئەم بارودۆخە سەرسوڕهێنەرە! لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە سەرتاپاگیرە کە مرۆڤ کاتێك تەماشای ملیۆنان کەس دەکات کە لە بەدبەختی و لەناوچوون**

و لەژێر کۆتی دیلەتی تاکەکەسێکدا ژیان بەسەردەبەن، زێتر دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە تا ئەوەی سەری بسوڕمێت... (١٠) ئەم کۆیلایەتیە سەرتاپاگیرە، لە رواڵەتدا لەجێی ئەوەی ئەنجامی ترسێك بێت، ئەوا بەرهەمی جۆرێکە لە رێکەوتن. ئایا دەتوانین ملکەچی لە فەرمانڕەوایەکی ئەوتۆ بەترس ناوبەرین؟ .... ئەگەر سەد یاخود هەزار کەس بەرگەی پایەخوازی و هەوەسبازیەکانی فەرمانڕەوایەکی ستەمکار بگرن، ئایا باشتر نیە لە جێگەی ئەوەی بڵێین ئەو فەرمانبەرانە ترسنوك و بێ غیرەتن، بڵێین کە هاندەرێك یان مەیلی ڕاپەڕینیان لەدژی ئەو  نییە، و ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەلالەت لە ترس ناکات، بەڵکو نیشانەی بێباکیە؟ ... کاتێك هەزاران و ملیۆنان کەس و هەزران شار توانای ئەوەیان نییە لە بەرامبەر باڵادەستی تاکەکەسێکدا بەرگری لە خۆیان بکەن ، ناتوانین ترس بکەینە هۆکاری ئەم مەسەلەیە؛ چونکە ترس ناتوانێت تا ئەو ئەندازەیە قووڵ وگشتگرەوە بێت... کەواتە ئەمە چ لاوازییەکە کە نەدەتوانین بەترس ناوی بەرین و نەتەنانەت وشەیەکی گونجاویش هەیە بۆی...؟ (١١)

ئەم دێرانە ئەوە نیشان دەدەن کە لابۆتی بەتوندی دژی ستەمکاری بووە، لەوەش زێتر دژی سازش و خۆبەدەستەوەدانی خەڵك بووە لە بەرامبەر ستەمکاریدا. ئەو راشکاوانە دەڵێ کە دژایەتییەکەی لەسەر بنەمای تیۆری ((یاسای سروشتی)) و ((مافی سروشتی لەپێناوی ئازادبووندا)) بەندە. هۆکاری ملکەچی مرۆڤ لە سەردەمی منداڵیدا ئەوەیە کە هێشتا وزەی ئەقڵی و هێزی لێك جیاکردنەوە تیایدا پەرەی نەسەندووە، بۆیە دەبێت ملکەچی دایك و باوکی بێت. بەڵام کاتێك دەگەینە ئەوەی ئەقڵمان پێ بگا دەبێت وەك مرۆڤێکی پێگەیشتوو و



ئازاد، پابەند بین بە ئەقڵ و ئاوەزی خۆمان نەك پاشکۆی کەسێکی دیکە. هەروەکو لابۆتی دەڵێت: ئەگەر ژیانی خۆمان بە ئاراستەیەکدا بەرین کە سروشت لە چارەی نووسیوین و فێری کردوین، پێویست بە گۆتن ناکات دەبێت ملکەچی باوانی خۆمان بین؛ وەلێ ئەم ملکەچییە لەساڵەکانی پێگەیشتوویی و گەشەسەندنی ئەقڵیدا مانای نامێنێ. لەم تەمەنەدا، پێویستە تاك تەنیا پەیڕەوی لە ئەقڵی خۆی بکات و نەبێتە ملکەچی هیچ کەسێك)). (١٢) ئەقڵ رێنومایکەرێکە ئێمە بەرەو واقعیەتەکان و یاساکانی سروشت و هەروەها بە ئاراستەی رەوتی دروستی مرۆڤایەتیدا دەبات. هەر مرۆڤێك ((لە ناخی خۆیدا تۆوێکی لە ئاوەز و ئەقڵ هەیە کە ئەگەر بەباشی پێ بگات و پەروەردەی بکات قابیلی پشکۆتنە؛ بەڵام ئەگەر ئەم توانا چاکانە نەتوانن رووبەڕووی کەموکووڕی هەلومەرجەکانی دەوروبەر ببنەوە، ئەوا بۆگەن دەکەن.)) (١٣) لابۆتی ئەوەش زێدە دەکات کە ئەقڵ، دەبێتە هۆی بێدارکردنەوەی یەکسانخوازی و مەیل بەرەو ئازادی و یەکسانی مرۆڤەکان؛ بیرکردنەوە یان ئەقڵمەندی ئەوە پیشاندەدات کە سروشت لەتەك هەموو ئەو نیعمەتانەی کە بە مرۆڤی بەخشیوە توانایەکی هاوبەشیشی بەمرۆڤ داوە، ئەویش هێزی قسەکردنە. کەواتە ((کەمترین دوو دڵیەك لەسەر ئەوە نیە کە هەموو ئێمە بەپێی سروشتی خۆمان ئازادین)) هەر لەبەر ئەمەشە کە ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین ((سروشت لە سەرەتاوە بەشێك لە مرۆڤەکانی وەك کۆیلە هێنابێتە دونیاوە.)) (١٤)

نووسەری ئەم نامەیە ئاماژە بەوە دەکات کە تەنانەت ئاژەڵەکانیش غەریزەیەکی زگماکیان بۆ خۆئازادکردن لە خۆدا پیشاندەدەن. کەواتە ((چ هۆکارێك، مرۆڤ، ئەم تەنیا دروستکراوەی کە بەڕاستی بۆ بەئازادی ژیان لەدایك دەبێت، تا ئەو ئەندازەیە لە سروشتی خۆی دوورخستۆتەوە.

چۆنکە مرۆڤ بیرەوەری یەکەمی لە دەست دەدات و مەیلی گەڕانەوەی بۆ دۆخی سەرەتایی لەبیرچۆتەوە؟» (١٥)

بانگهێشتی بێ نموونەی *لابۆتی* بۆ سەرپێچی مەدەنی و دژایەتی بە کۆمەڵیانەی ناتوندوتیژی لە پێناوی سەرنخونکردنی ستەمکاریدا راستەوخۆ لەو دوو پێش گریمانەیەی سەرەوە هەڵقوڵاوە:

یەکەمیان ئەوەی کە هەموو حکومەتەکان لەسەر بنچینەی رەزامەندی و ویستی ئاپۆرە فەرمانبەرەکان دروست بوون، ئەوی تریان کە ئازادی سروشتی نرخێکی بەرزی هەیە، چونکە ئەگەر ستەمکاری بەڕاستی لەسەر بنەمای ویست و رەزامەندی خەڵکەوە دروست بووبێت، ئەوکات تاکە رێگەیەك بۆ سەرەونخوکردنی ستەمکاری، وازهێنان یان وەرگرتنەوەی رەزامەندی ئاپۆرەکانە لە ستەمەکاری. بەهۆی شۆڕشێکی ئاشتیخوازانەی لەم جۆرە، ئیعتبار و بەهای ستەمکاری بە جارێك دادەرمێتە خوارەوە. سەیر نییە کە *دەیڤد هیۆم* فەیلەسووفی پارێزگاریخوازی ئینگلیزی، بەپێی تیۆرەکەی لەبارەی رەزامەندی ئاپۆرەکانی خەڵك وەك بناغەیەك بۆ هەموو دەوڵەتەکان، بەهەمان ئەنجام گەیشتووە.

*لابۆتی* دوای ئەوەی بەو ئەنجامە دەگات کە هەموو ستەمکارییەکان پشتیان بەویستی گشتی بەستووە ئەنجامگیری دەکات کە :«لە پێناوی زاڵبوون بەسەر زۆرداردا، پێویستیمان بە شەڕ یان تێکوشان نییە؛ چونکە ئەگەر هەموو خەڵکی دەست لەو رەزامەندیە هەڵگرن زۆردار خۆبەخۆ دادەرمێت.» پێویست ناکات بەزۆری هێز پاشەکشێ بە فەرمانڕەوای ستەمکار بکەین، تەنیا بەسە کە ئەو دابڕکەین لە پشتیوانی دارایی و هەرەمەکانی دەسەڵاتی لێ بسێنینەوە.

*لابۆتی* ئەوە رادەگەینێ کە هەرچەند ئاپۆرەکان زێتر خۆبەدەستەوە بدەن و گوێڕایەڵ بن، ستەمکارانی چەوسێنەر هێز و دەسەڵاتێکی زۆرتریان



دێتە دەست. بەڵام ئەگەر خەڵك بەلای کەمەوە واز لە ملکەچی بهێنن «زۆرداران» دەبن بە «هیچ». پاشان *لابۆتی* «هەژاران، ستەملێکراوان و ناهوشیاران» هاندەدات بۆ پچراندنی زنجیرەکانی خۆبەدەستەوەدان و ملکەچی و داوایان لێدەکات کە بە خۆدوورگرتن لە پەسەندکردنی زۆرداری کە چەکێکە لە دەستی زۆرداراندا، ئەوان لە بەردەوامیدان بە ستەمکردن رادەوەستێنن. لە راستیدا زۆردارێك:

**هیچ دەسەڵاتێکی نییە جگە لەو دەسەڵاتەی کە ئێوە پێتان سپاردووە تاکو لە ناوتان ببات. ئەگەر ئێوە بۆ خۆتان چاوی پێ نەبەخشن، ئەو هەموو چاوانەی لە کوێ بوو تا چاودێریتان بکات؟ ئەگەر خۆتان دەست و بازووی پێ نەبەخشن ئەو لە کوێ ئەم هەموو دەست و بازووە دەستەبەر دەکات تا ئێوە سەرکوت بکات؟ ئەگەر خودی ئێوە هێزی پێ نەبەخشن، ئەو چۆن دەتوانێ فەرمانڕەوایتان بەسەردا بکات؟ ئەگەر ئێوە هاوکاری لەگەڵدا نەکەن، چۆن ئەو دەتوانێ بە گژتاندا بچێتەوە؟**

*لابۆتی* ئاپۆرەکان دڵنیا دەکاتەوە کە لەپێناوی لەناوبردنی ستەمکاریدا پێ ناوێ دەست بۆ توندوتیژی یان بۆ خوێنڕێژی بەرن؛ بەڵکو «بەسە داوای ئازادی بکەن» تا بەم ئامانجە بگەن، ئەمەش ئەنجامێکە کە ئەو لە چوارچێوەی رێنماییەکدا دەیخاتە ڕوو.

بە کورتی،

**کاتێك بڕیار بدەن کە چیدی کۆیلە نەبن، زووبەزوو ئازاد دەبن. نالێم بەزۆری بازوو و بە گوشاری فیزیکی، زۆردار لە کورسی دەسەڵات بهێننە خوار" بەڵکو دەڵێم تەنیا ئەوەندە بەسە کۆتایی بە**

**پشتگیری کردنتان بێنن بۆ ئەو، ئەوکاتە دەبینن کە چۆن کۆڵەگەکانی ئەم پەیکەرە گەورەیە دەکەونە لەرزین و دادەڕمێنە خوارەوە.(١٦)**

لە سەدەکانی ناڤیندا، وا باو بوو کە ئەو فەرمانڕەوا ستەمکارانەی یاسا یەزدانیەکانیان پێشێل دەکرد بەمەرگ مەحکوم بکرێن، بەڵام ئامۆژگارییەکانی *لابۆتی*، هەرچەند ئاشتیخوازانە، وەلێ لە قووڵایی خۆیدا زۆر بە زەبرتر و سەرکەوتووترن لە تیرورکردن یان لە سێدارەدانی شۆڕشگێڕانەی ستەمکارێك، کردەیەکی تاکەکەسی و تاکڕەوانەیە، کە لە سیستمێکی سیاسی ئەکتیڤدا شوێنی لە ئیعرابدا نییە. بەڵام گوێڕایەڵی نەکردن لەلایەن ئاپۆرەکانەوە کە کردەیەکی بێ میانە و لایەنگیرانەیە بۆ زۆربەی ئاپۆرەکانی خەڵك، زۆر شۆڕشگێڕانەتر لەقەڵەمدەدرێت و لە ناخی سیستمێکی سیاسیدا، دەبێتە هۆی گۆڕانکاری قووڵ. لەڕوانگەی تیۆریشەوە، هەروەك *لابۆتی* دەڵێت، دەسەڵات بیەوێ و نەیەوێ پشت بە ڕەزامەندی گشتی دەبەستێت؛ کەواتە بە نەهێشتنی ڕەزامەندی گشتی «دەسەڵات» دووبارە دەبێتەوە. (١٧)

بانگهێشت کردنی ئاپۆرەکانی خەڵك بۆ ملکەچ نەکردن کە *لابۆتی* خستبوویە ڕوو، لەلایەن *پرۆتستانەکانەوە* هەڵبژێردرا و لە یەکێك لە بڵاوکراوە زۆرتوندەکان کە ئۆرگانی *هۆگنۆییەکان* بوو بەناوی Le France Turquie (١٥٧٥) چاپکرا. لەم وتارەدا، داوا لە دانیشتوانی شار و شارۆچکەکان کرابوو تاکو باج و سەرانە نەدەن. (١٨) هەڵبەت لە نێوان ئەوانەی بەم ئامۆژگارییە رازیبوون، واتە سەرپێچی کردنی ئاپۆرەکان، بیریاری ئانارشیستیش پەیدا دەبن کە شرۆڤەکردن و ڕوونکردنەوەکانی *لابۆتی* سەبارەت بە حکومەتی ستەمکار بەسەر هەموو جۆرە حکومەتەکاندا دەگشتێنن. بەناوبانگترینیان بریتین لە *تۆڵستۆی*،



*تۆلستۆی* و *بنیامین ئار. تاکەر* کە هەرسێکیان لە هزرڤانەکانی سەدەی ١٩ و پابەند بە لقێکی ئاشتیخواز لە قوتابخانەی ئانارشیزم دەژمێردرێن. *تۆلستۆی* لە پێناوی خستنەڕووی هزری خۆی و بانگەشەکردنی ئانارشیزمی ئاشتیخوازانەدا سوودی لە یەکێك لە دەقە دوور و درێژەکانی ئەم نامەیە وەرگرت لەناو باسەکەیدا. (١٩) «*گوستاڤ لاندوئێر*»یش کە یەکێك بوو لە رابەرەکانی ئانارشیستە ئەڵمانیەکان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، دوای ئەوەی مەیلی ئاراستەی ئاشتیخوازانەی پەیدا کرد کورتەیەکی نامەکەی *لابۆتی* خستە ناو کتێبەکەی بەناوی شۆڕش (١٩١٩). یەکێکی تر لە پێشڕەوانی ئانارشیزمی ئاشتیخوازی هولەندا، *بارتولو دۆلیت*، چەند بەشێکی لە کتێبی زاڵبوون بەسەر توندوتیژیدا تەرخان کرد بۆ شرۆڤەکردن و لێکدانەوەی نامەکەی لابۆتی و لەساڵی ١٩٣٣دا وەریگێڕایە سەر زمانی هۆڵەندی. (٢٠)

زۆر لە مێژوونووسانی قوتابخانەی ئانارشیزم لەمەش زێتر رۆیشتوون، نامەی *لابۆتیان* لە ریزی بەرهەمە ئانارشیستیەکان داناوە کە هەڵبەت ئەمە هەڵەیە، چونکە *لابۆتی* هەرگیز لێکدانەوەکانی خۆی لەبارەی حکومەتی ستەمکاری بە رەتکردنەوەی جەوهەری حکومەت و دەوڵەت نەگشتاندووە و بە ئاکامێکی لەو بابەتە نەگەیشتووە. (٢١) وێڕای ئەوەش کە ناتوانین لابۆتی بە ئانارشیست بزانین، رەخنەی توندی ئەو لە ستەمکاری و سەرتاپاگیری فەلسەفەکەی رێگەمان پێ نادا بەو شێوەیە بگشتێنین. ئەم خاڵە لە ژیاننامەی *لابۆتیدا*، بەرهەمی *پول بۆینفۆن* بە باشی دیارە. ئەو لەبارەی نامەکەی *لابۆتیەوە* دەنووسێت:

*لابۆتی* بەدروستی دەرکی بە جیاوازی نێوان دەسەڵاتداریێتی یاسایی و دەسەڵاتداریێتی ناڕەوا نەکردبوو، و ئەو بەو وێنە هەڵەیەوە هێرش دەکاتە سەر پرەنسیپی فەرمانڕەوایی، تێگەیشتنێکی ساکار و ناڕاست دەخاتە

رووی، ئەو لە رواڵەتدا لەسەر ئەو بڕوایەیە کە مرۆڤەکان دەتوانن بێ دەوڵەت و کۆمەڵگا، واتە لە هەلومەرجێکی «سروشتی»دا بژین و تەسەور دەکات کە ئەم بارودۆخە دەبێتە هۆی بەختەوەری مرۆڤ؛ بەڵام ئەمە خەونێکی منداڵانە و خەیاڵێکی بەتاڵە... (٢٢)

بە بڕوای *پییر مسنار* کە شرۆڤەکارێکی وردبینە، تێگەیشتنی بۆینفۆن زۆر هەڵەیە و دوورە لە راستی. *مسنار* پێیوایە کە *لابۆتی* ستەمکاری، لەبنەمادا، بەراهێنانی دەسەڵاتی تاکەکەسی پێناسە کردووە. (٢٣)

پێناسەکەی *لابۆتی* چوارچێوەی پێناسەی نەریتی گۆڕی کە ستەمکاری تیایدا، پاوانکردنی دەسەڵاتە یاخود حکومەتی «نایاسایی» یە. (مەبەست لە «یاسا» یاسای باو، یاسای خوایی، یاخود یاسای سروشتی بووە کە بەختەوەری گشتی زامن دەکات.) (٢٤) تێبینی دەکرێت کە تیۆرە کۆنەکە تەنیا جەخت دەکاتە سەر ئەو ئامرازانەی کە زۆردار بە دەسەڵات دەگەیەنێت و هەروەها لەسەر ئەو سوودەی کە ئەو (زۆردار) لە دەسەڵات وەری دەگرێت. بەڵام *مسنار* بەبیرمان دەهێنێتەوە کە پێناسەی *لابۆتی* راستەوخۆ سروشتی دەسەڵات دەخاتە ناو ناوەندی سەرنجدانەوە. ستەمکاری بەو شێوەیەی کە تیۆرەوانە نەریتییەکان تەسەوریان دەکرد پەیوەندی بەو ئامرازە نایاساییانەوە نییە کە بە هۆیانەوە بە دەسەڵات دەگەن و بەپێویست دیکتاتور پاوانکەرنییە.

بەهەمان شێوەی کە *لابۆتی* دەڵێت، «زۆرداران سێ دەستەن: دەستەی یەکەم خەڵکی هەڵیان دەبژێرن، دەستەی دووەم بە یارمەتی سوپا و بەزۆری چەك بە دەسەڵات دەگەن و گرووپی سێیەم، دەسەڵات بەمیرات وەردەگرن.» (٢٥) پاوانکەران یاخود داگیرکەران هەمیشە بە شێوەیەك کاردەکەن کە دەڵێی فەرمانڕەوایی بەسەر وڵاتێکی داگیرکراودا دەکەن؛ ئەمانەی لە بنەماڵە پاشایەتییەکاندا لەدایك دەبن «هێندە باشترنین لە



گرووپی یەکەم، چونکە هەر لەسەرەتای لەدایکبوونەوە، لە مەمکی زۆرداری دەمژن و هاوشان لەگەڵ ئەو شیرەی دەینۆشن، رەمەکەکانی ستەمکاری وەردەگرن و وای بۆ دەچن کە خەڵکان و ژێردەستان، کۆیلەگەلێکن بە میرات بۆیان ماونەتەوە.» *لابۆتی* دەستەی یەکەم، واتە ئەو زۆردارانەی کە خەڵکی هەڵیاندەبژێرن، «شیاوی تەحەموولتر» لەقەڵەم دەدات بەڵام ئەوان بەزۆری سەرقاڵی دۆزینەوەی ئەو فرت و فێڵانەی تا بەهۆیانەوە هەڵبژاردن لابەرن و بیگۆڕن بۆ حکومەتێکی رەهای میراتی و لەبەرئەوەش «لە رووی ستەمپیشەییەوە»، بە پێش زۆردارانی تر دەکەون... ، چونکە هیچ هۆکارێکی تر بۆ سەپاندنی ئەم دیکتاتورییە نوێیە نادۆزنەوە، جگە لەوەی کە کۆنترۆڵی زێتر و سەختتر، و ژێردەستانیش هێندە لە هزری ئازادی دووربخەنەوە کە تەنانەت ئەگەر یادەوەرییەکی ئەویش (ئازادی) هەبێت، ریشەکێش بکەن.» *لابۆتی*، بەگشتی، لەنێوان ئەم سێ جۆرە زۆردارانەدا، هیچ یەکێکیان بەشیاوی هەڵبژاردن نازانێت:

> **چونکە ئەگەرچی رێگاکانی بەدەسەڵات گەیشتن جیاوازن، بەڵام شێوازی فەرمانڕەوایی هەرسێ گروپەکە بەکردەوە یەکە؛ ئەو دەستەیەی کە هەڵدەبژێرێت بە جۆرێك رەفتار دەکات کە دەڵێی بڕیارە گایە کێویەکان ماڵی بکات؛ داگیرکەران و دەستبەسەرداگرەکان، خەڵکی دەکەنە قوربانی؛ و میراتخوازەکانی ستەمکاریش وەك کۆیلەی خۆیان رەفتار لەگەڵ خەڵکی دەکەن. (٢٦)**

بەر لە هەرشتێك، لە دەقی ناوبراودا، *لابۆتی* زۆردارە «هەڵبژێراوەکان»یش وەك دوو گروپەکەی تر تاوانبار دەکات. سەرەڕای ئەوەش دەڵێت کە: «هەبوونی چەندین گەورە، ژمارەیان هەرچەندێ بێت،

چەند جارێك زێتر جێگەی داخە.» (٢٧)، [مەبەست، حکومەتی زۆرینەیە. و] چونکە بە بۆچوونی *لابۆتی* ستەمکاری واتە پیادەکردنی دەسەڵاتی تاکەکەسی، بۆیە هەردوو جۆری حکومەتی میراتی لە ژێر ناوی ستەمکاری رەتدەکاتەوە. بەم پێیە، ڕاڤەکەی *مسنار* ڕاڤەیەکی کەموکووڕانە و ناتەواوە. (٢٨) ئەم خاڵانە، بە لەناوبەری چەمکی کۆماری لەقەڵەم نادرێت، بەڵکو ئەو پێناسەیەی *لابۆتی* بۆ ستەمکاری کردووە، بە جۆرێك پێناسەی دەکەن کە بەلای دەربڕینە ئانارشیسیتیەکاندا بشکێتەوە.

بۆچی ئاپۆرەکانی خەڵك ستەمکاری رەها پەسەند دەکەن؟ بۆچی رێگەی بەردەوامی بە ستەمکاری دەدەن؟ بەتایبەتی لە هەلومەرجگەلێکدا کە حکومەتی رەها (بەلای کەمەوە وەك کۆبوونەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی کەسێکدا) تەنیا بە پشت بەستن بەخواست و رازیبوونی خەڵکی لەسەر پێی خۆی دەمێنێتەوە، و لە کاتێکدا کە نارازیبوونی خەڵکی دەتوانێت بەئاسانی ئەم ستەمکارییە سەرنگون کات. *لابۆتی* لەدرێژەی گوتارەکەدا دەپەرژێتە سەر ئەم پرسە بنچینەییە و بەشێوەیەکی سەرتاپاگیر، قووڵ، و هەمەلایەنە تاووتۆیی دەکات.

ئەو ئاماژە بەوە دەکات کە ستەمکاری لە سەرەتای کاریدا، واتە ئەو کاتەی کە تازە بەتازە دەیەوێت سەقامگیربێت، رووبەڕووی دژواریگەلێك دەبێتەوە، چونکە بەگشتی ئەگەر بڕیاربێت خەڵکی شتێك هەڵبژێرن، بەدڵنیاییەوە ئازادی هەڵدەبژێرن نەك کۆیلایەتی: «گومانی تێدانیە کە خەڵکی بەباشتر دەزانن پەیڕەوی ئەقڵی خۆیان بن نەك گوێڕایەڵی هەوەس و فەرمانەکانی تاکەکەسێك.» (٢٩) تاکە حاڵەتی ڕیزپەڕ هەڵبژاردنی



*شاول*[١] لەلایەن گەلی *بەنی ئیسرائیلەوە* بوو کە بەلاسایی کردنەوەی نەتەوەکانی تر شێوەی وەرگرت. جگە لەم حاڵەتە، ستەمکاری لەڕێگەی خستنەگەڕی زۆر یاخود فریودان، بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنرێت. سەقامیگری حکومەتی ستەمکاری بەم شێوە پاوانکارییانە، یان بەیارمەتی کودەتایەکی ناوخۆیی یان بە پشتیوانی سوپایەکی دەرەکییەوە مەیسەر دەبێت. هەندێ کات خەڵکی لە هەلومەرجە قەیراناوی و بارودۆخە ناچارییەکاندا، وەك شەڕوشۆر، کەسانێکی تایبەت وەك رێبەر یاخود فەرماندە هەڵدەبژێرن کە لەم حاڵەتەدا، بارودۆخێك دەڕەخسێت تا ئەم جۆرە خەڵکە پێگەی خۆیان موحکەم بکەن و بەشێوەی دیکتاتور بەسەر خەڵکیدا فەرمانڕەوایی بکەن. بەکارهێنانی زۆر و ستەم لەسەرەتادا بە تەواوی سروشتی و رێپێدراو دەردەکەوێت و بەرەبەرە لەپاش نەمانی هەلومەرجە ناچارییەکان، دیسان ئەگەر ئەم پیادەکردنەی زۆر و توندوتیژی بەردەوام بێت خەڵکی خووی پێوە دەگرن و زۆرداری لە بگرەو بەردەدا لەگەڵ خوو، بەهێز دەکەوێت؛ بەجۆرێك کە خەڵکی، بۆ خۆیان لەماوەیەکی کەمدا خوو بە کۆیلایەتی و نۆکەرییەوە دەگرن.

> **لە ڕاستیدا باڵادەستی و بە پاشکۆکردنی ئاپۆرەکانی خەڵك لە سەرەتای کاردا زەحمەتە، بەڵام نەوەی دواتر بەئاسانی گوێڕایەڵی پەسەند دەکەن و بەخواستی خۆیان و رەزامەندییەوە بەردەوامی**

[١] Saul (لەزمانی عیبریدا بەمانای خوازراو)، ئیبن قەیس لە نەوەی بنیامین، یەکەم پاشای بەنی ئیسرائیل کە لە نیوەی دووەمی سەدەی ١١(پێش زایین) فەرمانڕەوایی دەکرد؛ سموئیلی هەڵبژارد و سنووری خۆی فرەوانکرد و لەگەڵ فەلەستینیەکان جەنگا. ئەو لە یەکەمین شەڕدا شکاو بەوەی ئامادە نەبوو بەدیلی بکەوێتە دەست دوژمن، خۆی کوشت. وێڕای ئەوەی لەشەڕدا شکا، بەڵام زەمینەی یەکێتی نەتەوەیی و میللی جووەکانی بەرقەرارکرد کە جێنشینەکەی، داود، ئەوەی پاراست.

دەدەن بە ملکەچی بەمیرات بۆماوە لەنەوەی پێشووە، چونکە نەوەی پێشووتر جگە لەوە چارەیەکیان نەبووە. لەبەر هەمان هۆ، ئەو مرۆڤانەی لەژێر تەوقی زۆرداریدا دێنە دونیاوە و لە هەلومەرجی کۆیلایەتیدا گەورە و پەروەردە دەبن، رازی و قانعن و بەبێ هیچ هەوڵدانێك ستەمکاری بێ نقەکردن پەسەند دەکەن. ئەوان دۆخی ژیانی خۆیان تەواو بەسروشتی لەقەڵەم دەدەن و کەمترین تەسەوریان لەمەڕ مافە مرۆییەکانی خۆیان نییە... بەم شێوەیە دوو هۆکاری «نەریت» و «خوو» وا لە ئاپۆرەکانی خەڵك دەکەن نەوە دوای نەوە ستەمکاری پەسەند بکەن. (٣٠)

کەواتە لە کۆتایدا، هێزی خوو زاڵ دەبێت بەسەر مەیلی سروشتی مرۆڤ بۆ ئازادی، «چونکە ئەگەر رەمەك و توانا زگماکەکانی مرۆڤ، هەرچەندەش کە بەهێزبن، بەهێزنەکرێن بەرەو لاوازی مل دەنێن؛ بەڵام ژینگە هەمیشە بەشێوەی تایبەتی خۆی شێوە بەمرۆڤ دەبەخشێت و تواناگەلێکی تێدا پەروەردە دەکات کە لەوانەیە بەپێچەوانەی تەبعی سروشتی مرۆڤ بن.» (٣١)

کەواتە ئەوانەی کە کۆیلە و زۆرلێکراو دێنە دونیاوە، شیاوی بەزەیی پێداهاتنەوەن و هیچ گوناهێکیان نییە، «چونکە بەدرێژایی تەمەنی خۆیان تەنانەت سێبەری ئازادیشیان نەبینیوە و بەتەواوی بێ ئاگان لێی، هەربۆیەش دەستەوەسانن لە درککردنی درێوی و چەپەڵی کۆیلایەتی خۆیان...» لەکاتێکدا کە «مرۆڤ خۆی لەخۆیدا ئازاد و خۆی لە خۆیدا ئازادیخوازە.» لەگەڵ ئەوەش، لەرووی کەسایەتییەوە، مرۆڤ «هەر بە خۆڕسك بەدوای ئەو شتانەدا دەچێت کە بەدەستهاتن فێری کردووە...»



لابۆتی دەگاتە ئەنجام کە «نەریت و خوو یەکەمین هۆی خۆبەکۆیلەکردنن.»

مرۆڤەکان بەم زەینیەتەوە گەورە دەبن کە هەمیشە فەرمانبەر بوونە و باوکەکانیشیان بەم شێوەیە ژیاون؛ ئەوان وا بیردەکەنەوە کە هیچ رێگایەك جگە لەمە بوونی نییە و بۆ باوەڕهێنان بەخۆیان، روو دەکەنە نموونەهێنانەوە و بەراوردکردن و لاسایی ئەوانی دیکە دەکەنەوە و لەئەنجامیشدا، بەپشت بەستن بەم حوکمە کە هەمیشە هەر بەم شێوەیە بووە، مافی داگیرکردن دەدەنە زۆردار و ستەمکاران. (٣٢ و ٣٣)

هەروەها فەرمانڕەوا و زۆردارانیش بە پاساوگەلێك کە پێشتر دایانڕەشتوون، پەرە بەرێکەوتن و رازیبوون لەناو خەڵکیدا دەدەن. لە ڕاستیدا، دووەمین هۆ و هۆکاری سەرەکی لە دروستکردنی گوێڕایەڵی مەدەنیدا ئەمەیە. زۆردارەکان بە مەبەستی قەبوڵاندنی ئەو رازیبوونە، پەنا بۆ هۆکاری جۆراوجۆر دەبەن! یەکێك لەم هۆکارانە، مژوولکردن و دڵخۆشکردنی ئاپۆرەکانی خەڵکە بە بەرنامەگەلێکی جۆراو جۆرو جیاجیای کاتکوژی و گومڕاکەر:

> یارییەکان، نمایشە مژوولکەرەکان، پێکەنییەکان، گلادیتۆرەکان، ئاژەڵە سەیر و سەمەرەکان، میدالیاکان، پەیکەرەکان، ئەفیونەکان، کەرەستەکانی بێهۆشکردن.. شتی لەم بابەتە ئەو داوە بوو کە لە جیهانی کۆندا بۆ دیل کردنی خەڵکی بەکاردەهێنران و لە ڕاستیدا، بەهای ئازادی ئەوان و چەکێکیش بوون بەدەست ستەمکاریەوە. دیکتاتورەکانی کۆن بە یارمەتی ئەم کردە و خافڵاندنانە، ژێردەستە و کۆیلەکانیان ئارام، سەرشۆڕ و لەکۆت و بەندا دەهێشتنەوە؛ و

**ئاپۆرەکانی خەڵك، نوقمی کاتکوژیە درۆزنەکان و رابواردنە پووچەکان، لەوپەڕی دەبەنگی و سادەییدا فێردەبوون کە فەرمانبەر و گوێڕایەڵ بن، هەڵبەت نەهێندە ئابڕۆمەندانە کە منداڵان بە تەماشاکردنی وێنەی کتێبە دەرسیەکان، فێرە خوێندنەوە دەبن.(٣٤)**

بۆ ئاراستەکردنی رازیبوون، شێوازێکی دیکەش هەیە کە شێوازی ئایدیۆلۆژییە: فریودانی ئاپۆرەکان بەهۆی بەگوێدادانی ئەو درۆیەی کە زۆردار، مرۆڤێکی زانا، دادپەروەر، فێرخواز و چاکەکارە. *لابۆتی* ئاماژە بەوە دەکات کە ئیمپراتۆرەکانی رۆمی کۆن بەم تەڵەکەبازیانە، خۆیان بە پارێزگارانی مافەکانی خەڵك ناودەنا و لەنێو خەڵکدا وەك پاسەوان و پارێزەری ئازادیەکانی خەڵك خۆشەویست بوون. لە راستیدا، ستەمکاری لە سەردەمانی زوودا، خۆی لە بەرگی ئازادیخوازیدا پیشاندەدا، بەڵام لە رۆژگاری هاوچەرخدا، دیکتاتورەکان شێوازێکی هاوشێوە بەڵام زۆر ئاڵۆزتر دەگرنە بەر، چونکە «فەرمانڕەواکان ئەمڕۆ بەبێ پێشەکی هونینەوە و وتارخوێنی، و زۆرگوتنی دووبارە و... سیاسەتە کلیلیەکانی خۆیان جێ بەجێ ناکەن.» (٣٥)

پرۆپاگەندە و فێڵە ئایدیۆلۆژیەکان، شێوازێکە بۆ شێواندنی زەینی خەڵکی: «پاشا ئاشووری و ... مادەکان بەدەگمەن لەبەر چاوی خەڵکی سادەدا دەردەکەوتن نەوەك خەڵکی عامە گومان لە جیاوازی نێوان شاو خەڵکی ئاسایی بکەن...» لەبارەی تەخت و تاجەوە، رەمزی ئەفسانەیی و جادوویی هەڵدەبەستران تاکو «بەم رێگایە، ژێردەستەکان هانبدەن بۆ رێزنان و ستایش کردن... باسکردنی هەموو ئامراز و ئەو چەکانەی کە چەوسێنەرە کۆنەکان بۆ سەقامگیری و موکم کردنی حکومەتی خۆیان بە کاریان دەهێنان، جێگەی غەمباریە. وێناکردنی ئەو راستیە کە ئەوان چ



فێڵ و تەلەکەیەکیان بەکاردەهێنان و داننان بەم خاڵەدا کە خەڵکی عامە و ئاپۆرەکان تا چ ئەندازەیەك شێتانە و ساکار بوون، مرۆڤ غەمبار دەکات.. » (٣٦) زۆردارانی رۆژگاری کۆن چەند جارێك تائەوێ چۆنەتە پێش کە خۆیان بەپێگەی خوایەتیش گەیاندووە: ئەوان [ بەخراپە] سوودیان لە ئایین وەردەگرت بۆ موکم کردنی پێگەکانی دەسەڵاتی خۆیان و لە هەر شوێنێك کە پێویست بێت خۆیان دەبردە رێزی خواوەندەکانەوە تاکو بە مەبەستەکەیان بگەن.» (٣٧) کەواتە، «زۆرداران بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆیان دەستیان بۆ هەموو رێوشونێك بردووە تا خەڵکان نەك تەنیا گوێڕایەڵ و نوکەرئاسا بن، بەڵکو لەسەر سوپاسگوزاریش رابهێنن.» (٣٨) لەم رووەوە، *لابۆتی* فەرەنسای سەردەمی خۆی لەگەڵ ئەو نموونانەی کە پێشتر گوتران بەراوردکرد و ئاماژەی بە نموونەگەلێکی هاوشێوەکردووە؛ ئەو نموونەیەی کە *لابۆتی* لە رۆژگاری خۆی دەیخاتەڕوو، زۆر توند و تۆقێنەرە: «پێشەوا و رێبەرەکانمان لە فەرەنسا هاوشێوەی هەمان ئامراز و شێوازەکان (لەوانەش، قایل بوون بە پێگەی نیمچە خوایی بۆ کەسی پاشا) بەکاردەهێنن: ستایشکار و کاسەلێسانی دەربار، گوڵی سەوسەن (نیشانەی بنەماڵەی پاشایەتی)، دەفرە پیرۆزەکان، ئاڵای مەشخەڵی زێڕین» (٣٩) و لە درێژەیدا دەڵێت «نامەوێت گومان لەبیرو باوەر و دۆزینەوەکانی خۆم بکەم،» چونکە پاشاکانی فەرەنسا «هەمیشە لە سەردەمەکانی ئاشتیدا، هێندە شەریف و دەستکراوە و لە کاتی جەنگیشدا، هێندە ئازا و دلێر بوون کە دەڵێی سروشتی ئەوان هەر لە سەرەتای لەدایکبوونەوە لەوانی دیکە جیایە و دەڵێی خواوەند ئەوانی بۆ فەرمانڕەوایی و پارێزگاریکردن لە زنجیرەی پاشایەتی دروست کردوون.» (٤٠) کاتێك لەم دێڕانەی گوتارەکە ورد دەبینەوە تەنزێکی جوان تیایدا دیاردەکەوێت؛ بەتایبەتی لەو شوێنەی کە *لابۆتی* دەڵێت «تەنانەت ئەگەر

بەم شێوەیەش نەبوویێت))، ئەو راستی و دروستی ئەم نەریتانە ناباتە ژێر پرسیارەوە، چونکە هەمان ئەو نەریتانە رێڕەوێکی گونجاویان بۆ گەشانەوەی شیعری فەرەنسا رەخساندووە. ئەو بەئاخاوتنێکی کینایەئامێز دەگاتە ئەنجام کە ((بێ چەند و چون پێویستە بێ شەرم بم ئەگەر بمەوێت لەکەیەك بخەمە سەر پێشینە مێژووییەکانی وڵاتمان و بەم هزرەش، حەرەمی شاعیرەکانی فەرەنسا ببەزێنم.)) (٤١)

فەرمانڕەوا ستەمکارەکان، سەرەڕای شێوازە ناوبراوەکان بۆ سەرنجڕاکێشانی رەزامەندی خەڵك، روویان لە شێوازە ژیاری و ماددییەکانیش دەکرد و لەوانیش بەشێوەی نمایشگەلێکی پرۆپاگەندەیی وەك چەکێك سوودیان وەردەگرت؛ ئەوان بە سەدەقە و بەخشین، خەڵکیان فریودەدا و بەگوێیان دا دەدان کە حکومەت تەنیا بۆ بەرژەوەندی خەڵکی هەنگاو دەنێت و لە قازانجی خەڵکیدایە. ئاپۆرەکانیش پەیان بەم خاڵە وردە نەدەبرد کە ئەوەی وەك سەدەقە وەریدەگرن، لە راستیدا بەشێکی زۆر زۆر کەمە لەو دارایی و سامانەی خۆیان کە فەرمانڕەواکان بە تاڵانیان بردوون. بۆیە:

**زۆردارە رۆمییەکان... لە گۆشە و کەنارەکانی شاردا، خوانی ناز و نیعمەتیان رادەخست و (بۆ فریودان) خواردنیان بە خەڵکی عامە و چەقوکێش دەدا... ئەوان گەنم، مەی، و سکەی زیویان بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرد و ئەوکات هەموویان بێ شەرمانە هاواریان دەکرد: ((بژی پاشا!)) ئاپۆرە نەزانەکان تێنەدەگەیشتن کە ئەگەر پاشا لە دارایی ئەوانی نەدزیبا، ئەوا لە کوێی دەهێنا ئەو خێر و بێرانەیان بەسەردا ببەخشێتەوە. پاشاکان لە رۆژێکدا سکەی زیویان بە خەڵکی دەبەخشی و خەڵکی لەبەر سفرەی پارێزەرەکانیان خواردنێکی زۆر و بەلەزتیان دەخوارد، و لەجیاتی ئەوەش، ئاپۆرەکان لە بەرامبەر گەورەیی و**



**دەستکراوەیی *تێبریۆس*[1] و *نیرۆن*[2]، ستایشی ئەوانیان دەکرد و بوون و نەبوونی خۆیان دەخستە بەرپێی ئەوان؛ منداڵەکانیان بە هەوا و هەوەسی پاشاکان دەسپارد؛ تەنانەت درێغیان بە گیانی خۆشیان نەدەکرد.. خەڵکی عامەش هەمیشە بەمجۆرە رەفتاریان کردووە و بەتەواوی حەزەوە بەرتیلگەلێکیان وەرگرتون.. (٤٢)**

*لابۆتی* لە درێژەی گوتەکانیدا، نموونەگەلێکی بێ رەحمی و درندەیی ئاژەڵئاسایانەی نیرۆن و یۆلیۆس قەیسەر ئاشکرا دەکات و دەنووسێت

---

[1] Tiberius (تیبریۆس)، دووەمین ئیمپراتووری رۆم (٤٢ پ ز تا ٣٧ز)، پیاوێکی دەست کراوە بەڵام توند و خوێنرێژ بوو. ساڵی ١٤ زایینی بەسەر ئوگوستدا سەرکەوت و لە شوێنی ئەو لەسەر تەخت دانیشت، بەڵام سیاسەتەکانی ئوگوستی گرتنە بەر و تەنیا گوژمەی رێوڕەسم و جوانکاریەکانی دەربارەی کەمکردنەوە. بەسەپاندنی باج و سەرانەی پشت شکێن بەسەرخەڵکی زەحمەتکێشدا، خۆی لە پێش چاوی ئەوان کەم و ناشیرین کرد. لەدوا ساڵەکانی حکومەتەکەی، بەدگومان ببوو بەرامبەر ئەوانەی دەوروبەری؛ وای بۆ دەچوو کە هەموو دەربارییەکان مەبەستی پیلانگێڕانیان لەدژی ئەو هەیە و زۆر لەوانیشی دەرکردن یاخود کوشتن. دواجار کالیگولا بەسەریدا زاڵ بوو و لە فەرمانڕەوایی لابرا.

[2] Neron ئیمپراتوری خوێنرێژی رۆمی (٣٧ـ٦٨ز) لەنێوان ساڵەکانی ٥٤ـ ٦٨ بوو بە ئیمراتوری رۆم. باوکی دۆمیتیۆس ئینۆباربۆس و دایکی ئاگریپینا بوو کە مێردی بەکلۆدیۆسی یەکەم کرد و ئەویش رایسپارد کە نیرۆن بەکوڕی خۆی پەسەند بکات. لەدوای مردنی کلۆدیۆس، نیرۆن لەسەر تەخت دانیشت و دەسەڵاتی لە دەستی دایکی دەرهێنا. دایکی نیرۆن بە پاڵپشتی بریتانیکۆس، کوڕی راستەقینەی کلۆدیۆس کەوتە دژایەتی ئەو، بەڵام نیرۆن ژەهری دەرخواردی بریتانیکۆس دا و کوشتی. نیرۆن لەژێر کاریگەری ژنێك بەناوی پۆپایا سابینا فێرە رەفتاری درندە بوو، دواتر دایك و خێزانی خۆی کوشتن. بەپێی گێڕانەوەکان، پوپایا پیلانی ئاگرتێبەردانی ساڵی ٦٤ز رۆمای دارشتبوو و کەوتە گەڕان و بەدواداچوونی مەسیحیەکان و ئازاردانیان.

مردنی ئەم دوو ئیمپراتۆرە تاچەند بووە مایەی پەژارە و ماتەمینی خەڵك، چونکە ئاپۆرەکان ئەوانی بەمرۆڤی شەریف و مەزن لەقەڵەم دەدان.

لێرەدا *لابۆتی* بەڕاڤەکردنێکی توکمە کۆتایی بە شێوازی هەڵخەلەتاندن و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەم خەڵکە دەهێنێت. بەبڕوای پرۆفیسۆر *لویس*، ئەم شیکردنەوەیە درەخشانترین و گرنگترین بەشی تیۆریەکەی لابۆتیە. (٤٣) لابۆتی لێرەدا ناوی هیرارکیەتێك دەهێنێ کە پێکهاتووە لە یەکگرتووان، پارێزگاران، تابیعەکان، وەفادارەکان، گاردی ئیمپراتۆری و بیروکراتەکان. لابۆتی ئەم دەستەیە بە ڕەوتی بنەمایی و ڕازی باڵادەستی شا و بناغەی حکومەتێکی ستەمکار لەقەڵەم دەدات. (٤٤) لەم هیرارکیەتەدا بەشێکی بەرفراوانی کۆمەڵگا ئامادەیی هەیە کە بە پێچەوانەی ئەوانی دیکەوە فریوی سەدەقە و خێر و شێوازی تری لەم بابەتەیان نەخواردووە، بەڵکو کەسانێکن کە هوشیارانە لەژێر سایەی حکومەتی ڕەهادا ژیانێکی خۆش و بێ خولیا دەبەنەسەر. هەر لەبەر ئەوەش، پشکی ئەوان لە ستەمکاریدا لە ڕووی نەزانی یاخود لەسەر بنەمای خووپێوەگرتنەوە نیە، بەڵکو پشکێکی واقیعانە و ئەنجامی دەست تێکەڵکردنە.

لەم هیرارکیەتەدا کەسانێك هەن بەشی خۆیان لەو شتانە جیا دەکەنەوە کە تالان کراون، بۆ نموونە پێنج یان شەش کەس لە ڕاوێژکارەکانی پاشا هەن کە بەشدارن لە بەرژەوەندیەکانیدا، ئەم شەش کەسە بۆ خۆیان شەش سەد ژێردەستیان هەیە کە «لەژێر باڵی پارێزگاری ئەواندا ڕزقی خۆیان پەیدا دەکەن» ئەم شەش سەد کەسەش «شەش هەزار کەسی بەکرێگیراویان هەیە کە لە ئاستە جیاوازاکاندا جێگای خۆیان خۆشکردووە و ڕۆلی ڕاوێژکار یان میری میرنشینەکان، بەڕێوەبەرانی داراییە، هەروەها هەرەمی ستەم بۆ کۆکردنەوەی باج و سەرانە و



پیادەکردنی زەبروزەنگ، ئەمانە فەرمانبەری جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەن کە لە سەرەوە دەردەکرێن و تالانیەکی ئەوتۆ لە تەواوی وڵاتدا دەخەنەگەڕ کە ئەگەر پشتیوانی شەش سەد کەسەکەی سەروتر نەبێت، لە بەردەم تۆڕەیی خەڵکدا گیانیان ڕزگاری نەدەبوو» (٤٥)

بەم شێوەیە، ئەو هیرارکیەتەی کە بەسەر چارەنووسی خەڵکەوە فەرمانڕەوایە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا لەخۆیدا جێ دەکاتەوە؛ بەجۆرێك کە «سەدان هەزار و تەنانەت ملیۆنان کەس بەهۆی ئەم تاڵەوە بەستراون بەخودی پاشاوە.»

**کاتێك بەهۆی پشتیوانی کردنی بچووك و گەورەکان و لەژێر سایەی زۆردارێکدا؛ هەموو سوودە مادیەکان دەچنە بەردەست ژمارەیەکی کەم، لەچاوی ئەم ژمارە کەمەدا ستەمکاری هێندە سوود بەخش و بەنرخە کە وەك ئازادی لە ڕوانگەی ئازادیخوازانەوە.. ئەوکاتەی کە فەرمانڕەوایەك پایەکانی حوکمەتە ستەمکارەکەی خۆی پتەو دەکا، مشەخۆر و چەقوکێش... هەموو ئەو کەسانەی کە لە تەماعی کەڵەکەکردنی ماڵ و پایەخوازیدا دەسووتێن لە دەوری کۆدەبنەوە و یارمەتی دەدەن لە پتەوکردنی هێزەکەیدا تاکو پشکێکیان لە غەنیمەتەکان دەستەکەوێت و لە ڕژێمەکەشیدا، ببنە یەکێك لەو سەرکردانەی کە پێش دەکەون. (٤٧)**

هیرارکیەتی ئیمتیاز بەدەست هێنان بەڕیز لە دەوڵەمەندەکان، خاوەن دەسەڵاتەکان و بازرگانە گەورەکانەوە دەست پێدەکات و لەنێوان ئەوانیشدا، بازرگانی بچووك و تازە بازرگانان و لە کۆتایشدا، ئاپۆرەی خەڵك هەن کە بەهەڵە پێیانوایە لە گیرفانی پشتیوانیکەرەکانیانەوە شتێکیان بەنسیب دەبێ، بەم پێیە هەموو هەڵقەکانی ژێردەست و

تابیعەکان دابەش دەکرێن و بەو جۆرە دەستەیەکی زۆر لەوان وا خراوەتە مێشکیانەوە کە پێویستە پابەند و وەفاداربن لەئاست خودی حاکمدا، «دروست هەروەك بۆ قلێشاندنی پارچەدارێك پێویستمان بەوەیە تەڵەزمێك لەخۆی بکەینە پواز.» هەڵبەت ئەو سوپایەی کە زۆردار لە دەوروبەری خۆی کۆکردوونەتەوە لە هەلومەرجێکی تایبەتدا، دەکەونە بەر سزا. بەڵام «تەنیا ئەوکاتەی کە لە دژی ژێردەستەکان و ستەملێکراوەکان زەبروزەنگ پیادە دەکەن، بە دوور دەبن لە سزادان بە دەستی زۆردار خۆی». کورتەی گوتە ئەوەیە کە زنجیرەیەکی پێکەوە بەستراوی ملکەچی و کۆتوبەند، بەشێوەیەکە کە ئەوان لەبەرامبەر نوکەرایەتیەکەی خۆیاندا، بۆیان هەیە ستەمکاری لە ئاست باقی کەسانی کۆمەڵگاکەیاندا بنوێنن. (٤٧)

ئێستا ئەگەر ستەمکاری لەژێر کاریگەری هۆکاری وەك خووپێوەگرتن، زەبر، یاخود هەڵخەڵەتاندن و پرۆپاگەندە لە کۆمەڵگادا سەقامگیر بوو، چۆن دەتوانین ریشەکێشی بکەین؟ چۆن دەکرێ خەڵك بڕوای ئەوەی لا دروست بکرێت کە بۆ لەناوبردنی ستەمکاری پێویستە رەزامەندی خۆیانی لێ بستێننەوە؟ لابۆتی بەشێوەیەکی دروست ئەوە دەخاتە ڕوو کە یەکەم هەموو خەڵك ناکەونە ژێر کاریگەری خووەوە و بەئاسانیش هەڵناخەڵەتێن. بەبۆچوونی ئەو هەمیشە دەستەیەك مرۆڤی بژارەی بیرتیژ هەن کە بەڕاستی کاروبارەکان بەباشی دەرکدەکەن؛ «هەردەم کەسانێك هەن کە لەوانی دیکە زێتر تێدەگەن و هەست بە قورسایی کۆتەکان لەسەر گەردەنی خۆیان دەکەن. بەئاسانی خۆیان بە دەستەوە نادەن و بەردەوام لە هەوڵی پچڕاندنی زنجیرەکاندان.» ئەمانە ئەو کەسانەن کە بەپێچەوانەی «ئاپۆرەی دواکەوتوو»ەوە خاوەنی زەینێکی دووربین و چالاکن و «لەوانی دیکەش زێتریان خوێندووە و فێربوون.» ئەم جۆرە کەسانە هەمیشە و لە هەموو شوێنێك ئامادەییان هەیە: «تەنانەت ئەگەر ئازادی بەتەواوی لە هەموو دونیادا لەناوبچێت، ئەم جۆرە مرۆڤانە دووبارە دروستی دەکەنەوە و دایدەهێننەوە.» (٤٨)

بەبەڵگەی ئەو مەترسیەی کە ئەم گروپەی خوێندەواران بەشێوەیەکی زەبرەهێز دروستی دەکەن، زۆردارەکان بەزۆری رێ دەگرن لە بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و فێربوون لە سنووری حکومەتەکەیاندا و بەم پێیەش، ئەوانەی کە «خۆشەویستیان بۆ ئازادی لە خۆیاندا پاراستووە چیدی ناتوانن کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا بەجێ بهێڵن، چونکە تەنانەت ئەگەر ژمارەشیان زۆر بێت، هیچ پەیوەندیەك لەنێوانیاندا دروست نابێت و بەیەکتری نامۆن؛ لەژێر دەسەڵاتی زۆردارێکدا، ئازادی کارکردن، ئازادی دەربڕین و تەنانەت ئازادی بیرکردنەوەش لە دەست دەدەن و لە ناو خەونەکانیاندا تەنیا دەمێننەوە.» (٤٩) دەبێ ئەوە بڵێین کە *لابۆتی* لێرەدا گرەوی لە راڤەکارە مودێرنەکانی تۆتالیتاریزم وەك هانا ئارێنت بردۆتەوە. هەڵبەت هێشتاش کلاوڕۆژنەیەکی هیوا هەیە، چونکە ئێمە هێشتاکە بژاردە و نموونەگەلێکمان لە سیما دیار و نایابەکانی سەردەمانی پێشوو لەناو خەڵکدا هەیە. *لابۆتی* بڕوای وایە هێشتاکەش ئەگەری دەرکەوتنی پێشەوا قارەمانەکان هەیە؛ ئەو قارەمانانەی کە «ئەگەر بەبڕوایەکی پتەو و ویژدانێکی ساخەوە بڕیار بدەن پەیامی خۆیان بگەینن، هەرگیز تێکناشکێن» (٥٠) کەواتە ئەرکی دیاری ئەم بژاردە ئازا، مکوڕ و دانایانە بریتیە لە پێکەوەنانی سوپایەکی بەرگری شۆڕشگێر لە دژی فەرمانڕەوای رەها. ئەم کەسانە لە رێگەی فێربوون و خستنەڕووی راستیەکانەوە، هوشیاری لەدەستچووی خەڵك لەمەڕ ئازادیەوە دووبارە بگێڕنەوە و ئەو ئەفسانە و خەیالپڵاوانەی کە حکومەت خستبوویە مێشکی خەڵکەوە، لەزەینیان توڕ دەدەنە دەرێ.

سوپای بەرهەڵستکار، وێڕای بێدارکردنەوەی هزری خەڵك و وروژاندنیان، ئیمکانگەلێکی دیکەشیان لە هەگبەدا هەیە، لەوانەش، خاڵە لاوازەکان لە ژیانی ناسروشتیانەی زۆردار، لایەنگران و وابەستەکانیان. ژیانی دەروونی ئەوان بێزارکەر و پڕە لە ترس و دڕندەیی و بەتاڵیشە لە ئاسایش و ئارامی و شادمانی. ستەمکارەکان هەمیشە لە ترس و وەحشەتدان، ترس لەو رق و نەفرەتەی کە لە دڵی یەك بەیەکی خەڵکدا هەیە و ئەوانیش بەچاکی لێی ئاگادارن. (٥١) سوپاییەکان و تالانچییەکانیش ژیانێکی نەگبەتانەیان هەیە. هەموو ساتەوەختەکانی ژیانیان لە کاسەلێسی و خۆپێوەهەڵواسین و چەپەڵی و کەمی و نوکەرایەتیدا بەسەر دەبەن. ئەم کۆمەڵەیە «کاتێك تەماشای سیمای ڕاستەقینەی خۆیان دەکەن... بەڕوونی تێدەگەن کە ئەو ڕەعیەتانەی کە لەژێر پێی خۆیاندا پلیشاونەتەوە ژیانێکی ئازاد و باشتریان هەبووە.» (٥٢)

هەرچەند *لابۆتی* ئەوەندە بڕوای بە ڕۆشنگەری نیە، بەڵام بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی کە بێداری بیروڕاکانی خەڵك هێواش هێواش پێگەکانی ڕەزامەندی ئەوان (لە ستەمکاران) سست دەکات لە ئەنجامی ئەمەشدا کەلێنێکی فرەوان و سگەورە دروست دەبێت؛ بەجۆرێك کە ئەم بیرۆکراتیەتی نارازی خودی دەزگاکەش دەگرێتەوە. (٥٣)

باشترین ئەنجام لە ڕاڤەی *لابۆتی* و لە نووسینە درەوشاوەکەیدا سەبارەت بە خۆبەکۆیلەکردن، ئەم گوتەیەی *مەسنارە*. کە دەڵێت «*لابۆتیش* وەك *ماکیاڤیللی* بڕوای وایە کە دەسەڵات تەنیا بەهۆی ڕەزامەندی فەرمانبەران و گوێڕایەڵانەوە جێگیرە، لەوەدا نەبێ کە (*ماکیاڤیللی*) میر فێردەکات چۆن خەڵك ناچار بە خۆبەدەستەوەدان و



ڕەزامەندی بکات؛ لە کاتێکدا کە لابۆتی خەڵك فێر دەکات دەسەڵاتی واقعی و سەرپێچی و ڕەتکردنەوەی ملکەچی دایە.» (٥٤)

*ئاتین دولابۆتی*، دوای کۆتایی هێنان بە خوێندنەکەی لە قوتابخانەی ماف، وەك کارمەندێکی پلە بەرزی دیوانی پاشایەتی بۆردۆ دامەزرا. ئەو لە ماوەی خزمەتکردنیدا، هەرگیز نامەکەی چاپ نەکرد. تەنانەت لە یەکەمین وتار و نووسینەکانی خۆشیدا ئاماژەیەکی بەم نامەیەش نەکرد. بەشێوەیەکی بنەبڕ یەکێك لەو هۆیانەی کە *مۆنتنی* هاوڕێکەی خۆی (واتە *لابۆتی*) بەکەسێکی پارێزگار و وەفادار بە پاشا لەقەڵەمدەدا ئەوەبوو کە لابۆتی بەر لە یەکەمین رووبەڕونەوەی لەگەڵ مۆنتی (ساڵی ١٥٥٩) ڕوانگەی سیاسی خۆی گۆڕیبوو. لە کۆتایی ساڵی ١٥٦٢ کەمێك بەر لە مردنی، *لابۆتی* وتارێکی نووسی کە ماوەیەکی زۆر بوو لە بیرکرابوو. لەو وتارەدا کە هەڵوێستێکی پارێزگارانەی میانڕەوی گرتبوو بەر، دەوڵەتی هاندابوو تاکو ڕێبەرانی ئاینزای پرۆتستان سزابدات و کاتولیکەکانی فەرەنسا بەهێزبکات، داوای لە پاشا و ئەنجوومەن کردووە کە بەشێوازێکی میانڕەوانە بکەوێتە چاکسازی کەنیسە تاکو پروتستانتەکان ناچار بن یان بگەڕێنەوە سەر ئایینی کاتولیکی یاخود ـ لە حاڵەتی ڕەتکردنەوەی ئەمەدا ـ وڵات بەجێ بهێڵن. (٥٥)

هەڵبەت لە چاوەڕوانی بەدوور نیە کە فێرخوازێکی گەنج و هەوڵدەر و ڕادیکاڵی توندڕەو، بەهۆی پیشەیەکی پڕداهات و خاوەن ئیمتیازی بەرز، خۆی لەگەڵ بارودۆخەکە بگونجێنێت و ببێتە پارێزگارێکی بێ سەرئێشە. هەڵبەت سەبارەت بە *لابۆتی* مەسەلەکە تا ئەم رادەیە سادە نەبووە، چونکە ئەبستراکتبوونی ئەو باس و بابەتانەی کە لە نامەکەیدا خستوونیەتەڕوو، وەك نەبوونی پەیوەندی بابەتیەکانی نامەکەی بە هەلومەرجی دەستنیشانکراوی ئەو کاتەی فەرەنسا و گشتیبوونی

تیۆرییەکەی، هەر لە سەرەتاوە نووسەریان خستووتە سەر ڕێگایەك کە تیۆر لە پراکتیك جیا بکاتەوە. بەم پێیەش ئەو لە پانتایی تیۆریدا رادیکالە، بەڵام لە پانتایی پراکتیکدا بە مرۆڤێکی پارێزگار لەقەڵەم دەردرێت. لەلایەکی دیکەشەوە روو وەرگێڕانی *لابۆتی* لە مەسەلە ئەبستراکتەکان و ڕوونکردنەوەی بابەتگەلێکی تایبەت و دیاری ئەوتۆ کە پیشەکەی دەیانسەپاند، بووە هۆی ئەوەی کە بۆ رادیکاڵیەتی بەرایی ئەو بە خێرایی نەمێنێت وەك ئەوەی هەرگیز بڕوای بە رادیکالیزمێکی لەو جۆرە نەبووبێ. (٥٦)

ئەگەرچی میتۆدی ئەبستراکتیانەی ئەو بووە هۆی ئەوەی کە زوو واز بهێنێت لەو ئەنجامە زێدەڕۆیانەی لە کاتی چاودێریکردن و رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ واقیعیەتە دیارەکاندا، بەڵام بۆ خوێنەرانی قۆناغەکانی دواتر ئەم کاریگەریە پێچەوانە بووەوە، پابەندنەبوونی نامەکەی بە زەمەنەوە بووە هۆی ئەوەی کە ئەو ئەنجامانەی تیایدا خراونەتە روو بۆ مەسەلە و پرسەکانی داهاتوو، بایەخێکی رادیکالانەیان هەبێت. ئەمەش تەواوی ئەو چارەنووسە بوو کە نامەکە هەیەتی. ئەم نامەیە یەکەمین جار بە شێوەیەکی ناتەواو و بەبێ ناوی نووسەرەکەی، لە کۆمەڵە وتاری دەستەی پروتستانتە توندڕەوەکاندا ساڵی ١٩٧٤ چاپکرا؛ کە ئەگەری ئەوە هەیە لەلایەن *نیکۆلاس بارێن* و بە هاوکاری *تیۆدۆر بزا* نووسرابێت و سەرپەرشتی کرابێت. (٥٧)

دەقی تەواوی نامەکە هاوشان بەناوی نووسەر، دوو ساڵ دواتر لە هەمان کۆمەڵە وتاردا، لەژێر چاودێری وەزیرێکی کالڤینستی جنێڤدا، بەناوی *سیمۆن گۆلار* بە چاپ گەیەنرا. (٥٨) *مۆنتنی* بە چاپکردنی ئەم نامەیە لەناو دەفتەری وتارەکانی پرۆستانتە شۆڕشگێڕەکاندا زۆر تووڕە بوو. ئەو مەبەستی وابوو بۆ خۆی نامەکە بڵاوبکاتەوە. ئەگەرچی لەو



کاتەدا نەك هەر خۆی لەم کارە بەدوور دەگرت، بەڵکو هەوڵی دەدا بەهۆی جەخت کردنی لە سەر ئەو خاڵەی کە هاوڕێکەی واتە *لابۆتی* لەکاتی نووسینی نامەکەیدا ١٦ یان ١٨ ساڵە بووە پاساو بۆ سیمای پارێزگارخوازانەی *لابۆتی* بهێنێتەوە.

پرۆستانتەکان (*هۆگنۆکان*)یش لە بەرژەوەندی خۆیان سوودیان لە سیمای *لابۆتی* وەردەگرت. *هارۆلد لاسکی* دەنووسێت: «هەرچەند روحی نامەکەی *لابۆتی* زۆر دڵگیر و سەرنجڕاکێش بووە، بەڵام خەسڵەتی ئاشکرای کۆماریخوازانەی ئەکادیمی ئەم نامەیە بۆ سەردەمی لابۆتی درەنگ هەرس دەکرا و قورس دیار بوو». هەڵبەت لابۆتی بێکاریگەری نەبووە، بەڵام بە هەمان رادە بەپارێزەوە جوڵاوەتەوە کە ئەسقەفێکی ئەندام لە کەنیسەی ئنگلیزیدا ئیمکانی بووە لە دەیەی شەستدا مەیلی داروینزمی هەبێت. (٥٩)

ئەو نامەیەی کە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەدا لە فەرەنسا تا ڕادەیەك چووبووە خانەی لە بیرچوونەوە، لە سەردەمی رۆشنگەریدا (سەدەی هەژدە) وەك پاشکۆیەك بۆ بەرهەمەکانی مۆنتنی چاپکراو دووبارە خرایەوە ڕوو و هەڵبەت بەبێ ئەوەی ناوبانگێکی ئەوتۆ بەدەست بهێنێت.

دواجار، هەروەك چاوەڕێ دەکرا نامەکە دوای چاپکردنەوەی لە سەردەمی شۆڕشی گەورەی فەرەنسادا، پێگەی راستەقینەی خۆی لە ناوەندی ئەم شۆڕشەدا بەدەست هێنا. کەمێك دواتر یەکێك لە ڕادیکاڵەکان بە ناوی *ئابا دولامنێ* پێشەکیەکی توندی بۆ نووسی و سەر لە نوێ بە چاپی گەیاندەوە. لە ساڵی ١٨٥٢دا نووسەرێکی دی، لەپێناوی ریسواکردنی کۆدەتای *ناپلیۆنی* سێیەم، پێشەکیەکی بۆ ئەم نامەیە نووسی و بەچاپی گەیاندەوە. لە هەردوو سەدەی نوزدە و بیستیشدا ئەم نامەیە سەرچاوەیەکی ئیلهامبەخش بووە بۆ دەستەیەك لە ئانارشیستە

ئاشتیخوازەکان. بەم پێیەش ئەم بەرهەمە، بەدرێژایی چەندین سەدەی یەك لەدوای یەك، خۆشەویستی رادیکال و شۆڕشگێڕەکان بووە. بەمجۆرەش بیروڕا بوێرەکانی خوێندکارێکی گەنجی بەشی یاسا، قەرەبووی مەیلە پارێزگارەکانی یەکێك لە کارمەندە پایەبەرزەکانی دەربار بۆردۆی دەکردنەوە.

نامەکەی *لابۆتی* بۆ خوێنەری ئەمڕۆ بایەخێکی تایبەتی هەیە؛ بایەخێك کە ئەم بەرهەمە لە ریزی بەرهەمە مۆزەخانەیی و هەمەپەسەندەکان دەردەهێنێت و دەیکاتە بەرهەمێکی گەورە. نامەکە کتێبێك نیە کە تەنیا باس لە فەلسەفەی سیاسی یان راڤەی ئامانجە ئازادیخوازەکان بکات. چونکە *لابۆتی* کێشەیەکی خستووتە ڕوو کە هەموو ئازادیخوازان (و لە بنەڕەتدا، هەموو بەرهەڵستکارانی ستەمکاری) لە ئاستیدا دۆش داماون: ئەویش کێشەی دوورمەودایی یان ستراتیژیەتە. بەبوونی ئەو هێزە وێرانکەر و لە رێسابەدەرەی کە دەوڵەتەکانی ئەمڕۆ لە بەردەستیاندایە، چۆن دەتوانین دنیایەکی ئازاد و گۆڕاو دروست بکرێ؟ چۆن دەتوانین لێرەوە بچینە ئەوێ، لە جیهانێکی ستەمکار و رەگداکۆتاوەوە بۆ جیهانی ئازادی؟ لابۆتی بەسوود وەرگرتن لە میتۆدۆلۆژی سەروزەمەنی و ئەبستراکت، تێڕوانینێکی زۆر قووڵی لەبارەی ئەم کێشەیە کۆنە خستووتەڕوو. هەڵبەت ئەو تێڕوانینەی کە ئەو خستوویەتەڕوو، واتە ئەو راستیەی کە زۆر و ستەمکاری فەرمانڕەواکان لە دوورمەودادا رەزامەندی و خواستی ئاپۆرەی خەڵکی جێگیر دەکات، هێشتاکە ئەو ڕۆشنبیرانەی کە لە بەرامبەر ستەمکاری دەوڵەتدا هەڵوێستیان وەرگرتووە دەرکیان بەم شتە نەکردووە. بۆ نموونە زۆربەی نووسەرانی دژە کومۆنیست، لە بەرهەمەکانی خۆیاندا حکومەتی کومۆنیستی وەك دەسەڵاتێکی تیرۆر و توقاندن دەناسێنن. زۆربەی هەڵەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاش لەو



بڕوایەوە سەرچاوە دەگرن کە مەحاڵە عامەی خەڵکی وڵاتێك هزر و بیروباوەڕەکانی کومۆنیستی پەسەند بکەن یاخود باوەڕیان پێ بهێنن. لە نێو هزرڤان و فەیلەسووفە سیاسیە هاوچەرخەکانیشدا تەنیا لودڤیك فۆن میزز، پسپۆری ئابووری بازاری ئازاد ئاماژە بەو خاڵە دەکات کە هەموو دەوڵەتەکان پشت ئەستوورن بە خواستی زۆرینە.

لەگەڵ ئەوەدا کە دەزانین حکومەتی ستەمکاری لەدژی بەرژەوەندی و سوودی زۆرینەی خەڵکە، ئەی ئەم رەزامەندیە چۆن سەری هەڵداوە؟ لێرەدایە کە لابۆتی بەقووڵبوونەوەی ئاشکرای دەکات کە ئەو رەزامەندیە بەهۆی پرۆپاگەندەگەلێکەوە دەستەبەرکراوە کە زەینی ئاپۆرەی خەڵکی پڕ کردووە و سەردەستەی جێبەجێکەری ئەم پرۆپاگەندانەش خەڵکانێکی ئاراستەکەری شارەزا و لێزانن کە کاریشیان بریتیە لە ئاراستەکردنی سیمای چەوسێنەران. هۆکارەکانی وەك دەستگیرۆیی، فێرکردن، شانۆرازاندنەوە، خوتبەدان و خەیاڵپلاوی ئایدیۆلۆژی... کە ئەمڕۆ فەرمانڕەواکان لەپێناوی خەڵەتاندنی خەڵك و بەدەستهێنانی رەزامەندیان بەکاریان دەهێنن، هەمان ئەو هۆکارانەن کە لە سەردەمی *لابۆتیشدا* بەکار دەهێنران. تەنیا جیاوازیەك لەنێوان سەردەمی لابۆتی و سەردەمی ئێمەدا هەیە ئەوەیە کە لە ڕۆژگاری ئێمەدا ڕۆشنبیران و خوێندەواران هەرچی زێتر خزمەت بە زۆرداران دەکەن. هەر لەبەر ئەمەش یەکەمین ئەرکی بەرهەڵستکارانی ستەمکاری نوێ، ئەرکێکی فێرکاریە: بێدارکردنەوەی رای گشتی لەم پرۆسەیە، رۆشنگەری، پیرۆزی داماڵینی دەزگای حکومی. لەمەش بترازێ، بەڵگەی *لابۆتی* لەمەڕ ئەندازیاری و نەخشەدانانی بۆ بەدەست هێنانی رەزامەندی ئاپۆرەکانی خەڵك و ئەو رۆڵەی کە بیرۆکراتەکان و خاوەن بەرژەوەندیە ئابووریەکان لەم رووەوە دەیگێڕن، مەسەلەیەکی گرنگترمان بۆ ئاشکرا دەکات کە بەرهەڵستکارانی ئەمڕۆی

دەوڵەتسالاری لەئاست تێگەیشتنیدا دەستەوەستانن. بەشێکی فرەوانی چالاکیەکانی دەوڵەت، لە روانگەی خۆیەوە، لە بنەڕەتدا وەك «هەڵە» ناژمێردرێن، بەڵکو وەك ئامرازێك بۆ زێترکردنی دەسەڵات، نفووز دەستکەوت لێکدەدرێنەوە. پێویستە ئەوەمان لەیادبێت کە ئێمە لەگەڵ ماتوری بەهێزی چەوساندنەوەی ئابووری رووبەڕووین و هەر لەبەر ئەوەش، پێویستە پەروەردە و فێکردنی ئازادیخوازانەی خەڵك لایەنی چونیەتی قازانجخۆری، بەرژەوەندیە ئابووریەکان، پرۆپاگەندەکەرانی ئایدیۆلۆژی و بەرتیلخۆرانی حکومەتیش بگرێتەوە. بەرهەڵستکارانی دەستێوەردانی دەوڵەت خۆیان لە چوراچێوەی راڤەکردنێکدا سنووربەندکردووە کە ناویان ناوە هەڵەی تیۆری، بەمەش مەودای نفووزی خۆیانیان تەسککردۆتەوە. چونکە ئەوان مەبەستیان ئەوەیە بەهۆی راڤەگەلێکی ئاڵۆزەوە لەبارەی «هەڵە»، زەینی ئەو خەڵکە بپاڵێون کە توانای تێگەیشتنی ئەو جۆرە راڤەکردنانەیان نیە؛ ئەو ئاپۆرانەی کە بەئاسانی دەکەونە ژێر کاریگەری پروپاگەندەکانەوە و لەژێر کارتێکردنی پسپۆرانی شارەزای حکومیدا سەریان لێ دەشێوێت. بۆیە پێویستە پیرۆزی ئەم پسپۆرانە لەزەینی خەڵکدا بسڕدرێتەوە و ئەمەش شتێکە کە *لابۆتی* بەشێوەیەکی بنەبڕ جەختی لەسەر دەکاتەوە.

یەکێك لە تیۆریستە ئازادیخوازەکان بە ناوی *لایزندەر سپۆنەر*، نزیکەی چوار سەد ساڵ دوای *لابۆتی*، بەهێنانەوەی ئەو بەڵگەیەی کە دەڵێت پارێزگارانی حکومەت بەگشتی خەڵکانی ساکار و مرۆڤی نابەجێن، تێڕوانییێکی هاوشێوەی خستووتە ڕوو:

**پارێزەرانی حکومەتی پەرلەمانی هەروەك پارێزەرانی زۆربەی حکومەتەکانی دیکە، لەسێ دەستە پێکهاتوون:**



**١ـ خەڵکانی نابەجێ، کە چینێکی تاڕادەیەك چالاك و بەژمارە زۆر پێکدەهێنن، ئەوان وا سەیری دەوڵەت دەکەن کە هۆکارێکە بۆ بەدەستهێنانی دەسەلات، پلەو پایەخوازی، سوودخوازی.**

**٢ـ خەڵکانی سادە و فریوخواردوو، ئەمانیش بازنەیەکی بەرفرەوان پێکدێنن کە بەبێ دوودڵی، هەریەك لەوان بەو هۆیەوە کە خاوەنی راو بیروبۆچوونن و بەهەمان ئەندازەش سوود لەم مافە وەردەگرن کە خەڵکانێکی دیکە هەیانە بۆ چەوساندنەوە و دزی کردن لەمان. هەر ئەمانە بەوپەڕی دەبەنگی و سادەییەوە وا هەست دەکەن ئازاد و سەربەخۆن و لە سایەی حکومەتێکدا ژیان دەبەنە سەر کە تیایدا مافی بەرامبەر بۆ هەمووان رەچاو دەکرێت:**

**ئەمانە وای بۆ دەچن کە حکومەتەکەیان «باشترین حکومەتی سەر ڕووی زەویە» و تێڕوانینی لەم بابەتە.**

**٣ـ ئەو دەستەیەی کە تا ئەندازەیەك ئاگاداری شەڕانیەت و خراپەکاری حکومەتن و بەڵام رێگای خۆ لێ دەربازکردنی نازانن و ئەگەر بشزانن ئامادە نین شێلگیرانە بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان لە پێناوی گۆڕانکاریدا بکەنە قوربانی. (٦٠)**

کەواتە یەکەمین ئەرکی فێرکردنی تەنها بڵاوکردنەوەی هوشیاری تیۆری و ئەبستراکتیانە نیە سەبارەت بە «هەڵەکانی» حکومەت لەپێناوی بەرزکردنەوەی خوشگوزەرانی گشتیدا، بەڵکو لە پێناوی دوورخستنەوەی ڕای گشتیە لە گومڕایی عامەی خەڵك سەبارەت بە کۆی سروشت و شێوەکانی ئیشکردنی حکومەتی ستەمکار. لابۆتی لەمەڕ ئەم ئەرکەوە، لە جەختکردنەوەی لە سەر دەستەبژێری هوشمەند و پێشڕەو و هەروەها رۆشنبیرانی دژ بە دەوڵەتسالاری، رووی قسە لە ئێمە دەکات. ڕۆڵی ئەم

«گروپە» (واتە ڕۆشنکردنەوەی جەوهەری دەوڵەتسالاری و تێکشکاندنی پیرۆزی لە زەینی جەماوەردا) لەسەرکەوتنی زەبرەهێزانەی هەر ڕاپەڕینێکدا کە دەیەوێت کۆمەڵگایەکی ئازاد بونیات بنێت، کاریگەری دەستنیشانکراوی هەیە. هەر لەبەر ئەمەش گرنگترین و یەکەمین ئەرکی ئازادیخوازی، بریتیە لە دەستنیشانکردن، یەکخستن، پەروەردەکردن و بەرفرەوانکردنی ریزەکانی گروپی خۆیان؛ ئەمەش ئەو ئەرکەیە کە زۆربەی ئازادیخوازان لە ئاستیدا بێ ئاگا ماونەتەوە، چونکە کەڵەکەبوونی ستەم و بەدبەختی و هەژاری هەرگیز خۆبەخۆ نابێتە هۆی بەرپابوونی شۆڕشێك، مەگەر ئەو سەربڕارانە ئامادەبن و بتوانن ڕۆشنبیران و ئاپۆرەی خەڵك پەروەردە بکەن و ڕێك بخەن.

لە نامەکەدا، بەهەمان شێوە ئاماژە بەگرنگی ناساندن و هاندانی نارازی و سەرپێچیکەرانی ناوەوەی دەزگای دەسەڵاتدار و هاندانیان بۆ دەست لە کارکێشانەوە و خۆدانەپاڵ بەرەی دژ بە ستەمکاری کراوە. شایانی باسە هەرچەندە ئەم مەسەلەیە ڕۆڵێکی بنەڕەتی ئەوتۆی لە ڕاپەڕینێکی ئازادیخوازانەدا نیە، بەڵام هەموو ئەو ڕاپەڕینە دژە ستەمکاریانەی کە لە رابردوودا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، سوودیان لەم جۆرە نارەزاییبوون و ناکۆکیانەی ناو حکومەت بەتایبەتیش لە قۆناغی فرەوانخوازی و پەلوپۆ هاوێژی حکومەتەکان وەرگرتووە.

هەروەها *لابۆتی*، یەکەمین تیۆردانەرێکە کە بە جەخت کردنەوەی لەسەر گرنگی ڕەزامەندی و ڕێککەوتنی خەڵك (وەك پاڵپشتێك بۆ ستەمکاری) گەیشتووە بەگرنگی ستراتیژیەتی لابردنی حکومەت بەهۆی هاندانی ئاپۆرەکان لەپێناوی سەندنەوەی ئەو ڕەزامەندیە. ئا بەم پێیە *لابۆتی* یەکەمین کەسە دەپەرژێتە سەر تیۆری ستراتیژیەتی سەرپێچیکردنی مەدەنی ئاپۆرەکان بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە، لە



فەرمان و زەبرو زۆرەکانی حکومەت. هەڵبەت ناتوانین ئەوە دیاربکەین کە ئەم شێوازە چەندە پراکتیکیە یاخود لەکردەدا سەرکەوتووە، بەتایبەتی کە پێشینەیەکی پراکتیکی هێندەی لەبارەوە نیە. بەڵام ئەمڕۆ شێوازێکی تا ڕادەیەك هاوشێوە لە فۆرمێکی، لە شێوەی خۆدوورگرتنی خەڵك لە باج و سەرانە دان، بە شێوەیەکی زێتر لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا بەکاردەهێنرێت؛ هەرچەندە ئەمەش بەشێوەیەکی پەرتوبڵاو و ناوبەناو ڕوودەدات. لە دیسێمبەری ١٩٧٤ دانیشتوانی شاری ویلیمانتیك لە ویلایەتی کنکتیاکات، لە کۆبوونەوەیەکدا لە ئەنجومەنی شار، سێ جار بودجەی هەموو شاریان ڕەتکردەوە و دواجار سەرکەوتن لە کەمکردنەوەی باجە دیاریکراوەکاندا تا ڕێژەی لە سەدا ٩ ئەمە تەنیا نموونەیەکە لە پەرەسەندنی بەرهەڵستکاری خەڵك لەگەڵ باج و سەرانە پشتشکێنەکان.

*لابۆتی* سەبارەت بە دوارۆژی کۆمەڵگای ئازاد ئومێدەوارە. ئەو دەڵێت کاتێك خەڵکی ماوەیەکی درێژ لە ژێر کۆت و بەندی ستەمکاریدا بژین، خووی پێوە دەگرن و باوەڕیان بە ئەگەری ڕزگاربوون یاخود بوونی کۆمەڵگایەکی دیکە نامێنێت. بەڵام ئەم ڕاستیە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەگەر پێویستە ستەمکاری لەناو بچێت، ئەوا ناکرێت دەوڵەتسالاری لە شوێنی دابنێین و بەسەر خەڵکیدا بسەپێنین. تووێکلی خوو دەشکێ و دواجار دەوڵەتسالاری لەچاوی هەمووانـدا لە شێوەی ستەمکاریدا دەردەکەوێت. ئەگەر کۆمەڵگای ئازاد دەهاتە ئاراوە، ئەوکاتە ئەگەرەکانی پاراستنی ئەم کۆمەڵگایە زۆر لە ڕادەبەدەر دەبوون.

ئێستا ئاپۆرەکانی خەڵك، هەرچەند بەشێوەی نارێکخراو و پەرت پەرت، نە تەنیا لەدژی باجە قورسەکان، بەڵکو لە دژی شکۆ و ئیعتباری درۆزنانەی دەوڵەت، بۆ نموونە لە ڕووداوەکانی وەك واترگێت، هەرچی زێدەتر بەرهەڵستکاری خۆیان پیشان دەدەن. بەر لە بیست ساڵ،

مێژوونووسێك بەناوی *سیسیلیا کنیۆن* لە نووسینێکدا لەبارەی بەرهەڵستکارە دژە فیدرالیستەکانی پەسەندکردنی دەستووری ئەمریکا، بە دەنگێکی سەرزەنشتانە، ئەوانی بە «خەڵکێکی ئیمان سست» و خاوەنی بیروباوەڕی لاواز ناوبردن؛ هەڵبەت مەبەستی ئەو سستی لە ئیماندایە بە حکومەتی ناوەندی خاوەن دەسەڵات (٦١) ئەمڕۆ بە دەگمەن دەتوانین کەسانێك بدۆزینەوە کە باوەڕێکی وا هەڵنەسەنگێنراوی بە حکومەت هەبێت. لە سەردەمی ئێمەدا، هزرڤانەکانی وەك *ئاتین دولابۆتی* زۆر ئەمڕۆیتر و پێشڕەوترن لەوەی کە لەماوەی زێتر لە سەدەیەکدا بوون.

مارى ئێن. ڕۆتبارد[1]

---

١ Murray N. Rothbard مامۆستای بەشی ئابووری لە دامەزراوەی پولی تەکنیکی نیۆیۆرك و سەرنووسەری بڵاوکراوەی The Libertarinan Forum؛ ئەو چەند کتێب و وتارێکی لەبارەی بابەتە جۆراوجۆرەکان نووسیون؛ نوێترین بەرهەمی ئەو هزری ئازادی: کۆلۆنیالەکانی ئەمریکا لەسەدەی حەڤدەیەم ـ ە.



## پەڕاوێزەکان

١ـ فۆنەتیکە دروستەکەی، بەپێچەوانەی ئەوەی تەسەور دەکرێت، لابوئسی نیە بەڵکو لابۆتییە (بەتای شەدە لەسەر)؛ واتە هەمان بەو جۆرەی کە بە دیالێکتی پریگۆر (perigord) لەو ناوچەیەی کە لابۆتی لێی دەژیا، فۆنەتیکە دەکرا. باسی کۆتایی و بنەبڕ لەبارەی شێوەی فۆنەتیکە دروستەکەی دەکرێ لەم کتێبەی خوارەوە بەرهەمی پاول بۆنیفۆن، ل ٣٨٥ ـ ٣٨٦ دا ببینین:

Oeuvres Completes dEstienne de La Boetie (Bordeaux: C.Gounouilhou.and paris:J.rouam etCie.1982)، و pp.385.٦ –

2-Bonnefon، op.cit p.xlvi.

3-Pierre Masnard،L Essor de La Philosophie Politique Au XVIe siecle (paris:Boivin etCie،1936) P.391.

٤ـ ئەم نامەیە بۆ چەند ماوەیەك بەشێوەی دەستنووس مابووەوە و مێژووی ڕاستەقینەی نووسینی نامەی خۆبەکۆیلەکردن هێشتا جێگەی مشتومڕە وێڕای ئەمەش، ئەوەی کە ڕوون و دیارە و خاوەن بیروبۆچوونەکانیش لەسەری کوك و تەبان ئەوەیە کە بەسەرهاتە بڵاوکراوەکەی مۆنتێنی لەم بارەوە کە گوایە لابۆتی «نامەکەی» لە تەمەنی ١٦ یان ١٨ ساڵیدا نووسیوە، ڕاست نیە. گوتەکانی مۆنتێنی، وەك ئەوەی لە خوارەوە دەیبینین، ڕەنگە بەشێك بێت لە هەوڵ و تێکۆشانە درەنگترەکەی ئەو لەپێناوی پاراستنی ئیعتباری برادەرە لەدەست چووەکەی، لە ڕێی جیاکردنەوەی لە هۆگنۆ شۆڕشگێرەکان بوو کە دەستنووسەکەی لابۆتیان بەهی خۆیان دەزانی. لابۆتی بەوەی کە زۆر گەنج بوو

بووە هۆی ئـەوەی کـە بەرهەمەکـەی، وەك تەرشـوحاتی هـزری گـەنجێك و بـەو ناوەرۆکە رادیکاڵـەی کـە هـەیبوو، بەزەحمـەت، وەك دیـد و بۆچـوونی نووسـەر ببینرێت، بەڵام ناوەرۆکی زانستیانەی ئـەم بەرهەمـە ئـەوە نیشـان دەدا کـە بـە ئەگـەری زۆر نامەکـە لـە دەوروبـەری سـاڵەکانی ١٥٥٢ یـان ١٥٥٣، واتـە کاتێـك لابۆتی قوتابیەکی ٢٢ساڵە بوو، نووسیویەتی. بگەڕێوە بۆ.

Bonnefon, op. cit, pp xxxvi-xxxvii, mesnard, op. cit., pp 390-1, and Donald Frame.

Montaigne: A Biography (New York: Harcourt Brace, & world 1965), p.71.

هیچ ژیاننامەیەکی لابۆتی نیە. تاکە سەرچاوە لەم بـارەوە ئـەو پێشـەکیەیە کە بۆنیفۆن بۆ بەرهەمەکەی خـۆی Oeuvres Completes, op. cit, pp xi-1xxxv. نووسیویەتی و دواتر وەك بەشێك لە بەرهەمێکی دیکەی پاول بۆنیفـۆن ـ کەلە خوارەوە دێت ـ دووبارە چاپکراوەتەوە.

Paul Bonnefon, Montaigne et ses Amis (Paris: Armand colin et Cie, 1898). I, pp. 103-224.

5-Emile Brehier, Histoire de la philosophie, vol. I: Moyen Age et Renaissance, cited in Msnard, op. cit, p404n,

هەروەها بگەڕێوە بۆ:

Joesph Barrere, Estienne de La Boetie contre Nichlas Machiavel (Bordeaux, 1908), cited in ibid.

6- J. W. Allen, A History of Palotical Thought in the Sixteenth century (New York: Barnes and Noble, 1960), p.314.

7- Harold J.Laski", Introduction", A Defence of Liberty Against Tyrants (Glouester, Mass: Peter Smith, 1963), p.ll.



8-William Farr Church, Constituional Thought in Sixteenth Century France.

٩ـ دەیڤد هیـۆم ئـەم دوو پرەنسـیپەی بـەجیا دۆزینـەوە. دوو سـەدە دواتـر ئەوانی لە هەمان شێوازە کورت و روون و دیارەکەیدا خستنەڕوو:

بۆ کەسانێك کە بە دیدێکی فەیلەسووفانە دەڕواننە ئەوانـەی پەیوەسـتن بـە مرۆڤـەوە، هـیچ شـتێك سەرسـوڕهێنەرتر لـە سـادەیی و ئاسـانی فـەرمانڕەوایی کەمینە بەسـەر زۆرینـە و خۆبەدەسـتەوەدانی ئاشـکرانیە کـە مرۆڤـەکان ناچـار دەکـات تـاکو هەسـت و سـۆزەکانیان بکەنـە قوربـانی هەسـتەکانی فـەرمانڕەواکانیان. کاتێـك پـەی بـە ئـامراز و شـێوەکان ئـەم جـۆرە حکومەتـە دەبەین، ئەو سەرسامیە دوو هێندەی خۆی لێدێت، چونکە لەو شوێنەی کە زۆر و ستەم هەمیشە لە دژی زۆرینە (ئەوانـەی فـەرمانڕەواییان بەسـەردا دەکرێـت) پیادە دەکرێت، فەرمانڕەواکان جگە لە باوەڕەکانیان ناتوانن بەرگری لە هیچـی دیکە بکەن. بەم پێیەش، حکومەت تەنیا لەسەر بناغەی باوەڕ وەستاوە و ئـەم شـتەش زێـتر لەهـەر شـتێك لـەبارەی چەوسـێنەرترین و بـێ بـەزەییترین حکومەتەکان راستە" بەهەمان رادەش دەکرێ لەبارەی ئازادترین و مرۆڤانەترین جۆری حکومەتیش راست بێت. ( دەیڤد هیۆم، «لەبارەی بنـەما سـەرەتایەکانی حکومەت»، لە کۆمەڵەی وتارە ئەدەبی، ئەخلاقی و سیاسیەکاندا).

١٠ـ بگـەڕێوە بـۆ ل ٥٤ (هـەموو ئاماژەکـانی روتبـارد تایبـەتن بـە دەقـە ئەسلیەکەی لابۆتی بە زمانی فەرەنسی).

١١ـ ل ٥٦

١٢ـ ل ٦١

١٣ـ ل ٦٢

١٤ـ ل ٦٢

١٥ـ ل ٦٤

١٦ـ ل ٦٠

١٧ـ مەسنار دەنووسێت کە: ئەمە تیۆرێکی ((زۆر قوولْ و بەربڵاوە)) کە رەخنەگران هەرگیز وردەکاری و جەوهەری ئەویان درك نکردووە و ((بە تاکە رێگە چارەی مرۆیی بۆ چارەکردنی کێشەی دەسەڵات لەقەڵەم دەدرێت.)).

١٨ـ بگەڕێوە بۆ Laski، op.cit، p.29، Allen، op.cit، p.3 .

١٩ـ بەم شێوەیە تۆلستۆی دەنووسێت: ((پێگەی ستەمدیدەکان نابێت لەگەڵ ئەو سنووردارییانە بەراورد بکەین کە بەهێزەکان بەسەر لاوازەکاندا پیادەی دەکەن، یاخود ئەو گوشارەی کە زۆرینە دەیخاتە سەرکەمینە. لێرەدا راستیەکەی ئەوەیە کە ئەوە کەمینەیە ستەم لە زۆرینە دەکات و میراتگری حکومەتەکانی سەردەمانی کۆنترە کە لەسەر دەستی مرۆڤە زیرەك و ئاقڵترەکان دامەزراوە و ئەوە مرۆڤاکانن، بەپێی ئەو، یەکتری تالآن دەکەن..)) پاشان دوای هێنانەوەی گوتەیەکی درێژی لابۆتی دەگاتە ئەو ئەنجامە: (( وادەردەکەوێت کرێکاران، کە لە کۆت و بەندەکانی دیلەتی و بەکارگرتنی هیچ لایەنێك دەربازیان نابێت، لە ئەنجامدا دەبێت لە فریودان درۆی فەرمانڕەوا و لەسەر ژیانی خۆیان تێبگەن و بە ئاسانترین رێگا، خۆیان رزگار بکەن: خۆدوورگرتن لە بەشداری کردن لە توندوتیژی و ستەمکاری کە تەنیا بەهاوکاری ئەوان مەیسەر دەبێت.)) لیۆ تۆلستۆی، یاسای ئەوین و یاسای توندوتیژی، (Rudulph Field، New york: 1948 pp.43-45 ) سەرباری ئەوەی گوترا کتێبی نامەیەك بۆ هیندوسێك، بەرهەمی تۆلستۆی، کە لە فۆرمۆلیزەبوونی بیروباوەڕی گاندی لە بزاڤە ئاشتیخوازە جەماوەریەکەیدا رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو، زێتر لە ژێر کاریگەری نامەی لابۆتی نووسراوە. بگەڕێوە بۆ:

Bartelemy de Ligt، the Conquest of Violence (New york: E.P Dutton & Co، 1938).pp.105-6.



ئاتین دولابۆتی، Vrijwillige Slavirnig، The Hangue, 1933،
پێداچوونەوەی Bart. de Ligt کە باسکراوە لە:

Bart. de Ligt, op. cit., p289 & ibid., pp 104-106.

لەبارەی لاندوێر (Landauer)، بگەڕێوە بۆ:

ibid، p.106، and George Woodcock، Anarchism (Cleveland، Ohio: World pub. (Co، 1962)، p.432.

٢١ـ ماکس نێتلو (Max Nettlau) لەو مێژوونووسە ئانارش dsjhkm dm کە تووشی هەمان هەڵە هاتووە:

Max Nettlau، Der Vorfruhling Der Anarchie، Ihre Historische Entwicklung den Anfangen bis zum Jahre 1864 (Berlin، 1925.

لەم بارەوە بگەڕەێوە بۆ:

Bert F. Hoselitz، "Publishers Preface" in G.P. Maximoff، ed.، The Political Philosophy of Bakunin (Glencoe، Ill.: The Free press، 1953) pp.9.10.

یەکەمین مێژوونووسی ئانارشیزم ئی، ڤی، زینکەر (E.V Zenker) کە خۆی نائارشیست بوو هەمان هەڵەی دووبارە کردۆتەوە. ئەو لەبارەی نامەی لابۆتی دەنووسێت ((بەرگرییەکی پڕگەرم و گوڕی لە ئازادی تا ئەو شوێنە دەچێتە پێشەوە کە هەستی زەرورەتی بوونی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بەگشتی لەناو دەچێت)). باوەڕی لابۆتی ئەوەیە کە جۆری مرۆڤ پێویستی بە دەوڵەت نیە، تەنیا ئەوەندە بەسەر مرۆڤ خوازیاری بەختەوەری و ئازادی بێت تا وەکو پەرجۆێك بەدەستیان بهێنێت.

E.V. Zenker. Anarchism (London: Methuen & Go. 1898) pp.15-16.

22- Bennfon، op. cit"، .Introduction"، p.xliii.

بەکورتی، تەنانەت بۆنیفۆن کە پەرچەکرداری لە ئاست ناوەرۆکی زێدەڕۆیانەی نامەی لابۆتی پیشان داوە، لە ریزی بەرهەمە ئانارشیستەکاندا ناساندوویەتی.

23-Masnord, op.cit, p.395-6

٢٤ـ لەبارەی چەمکی کلاسیك و سەدەکانی ناڤینی ستەمکاری بگەڕێوە بۆ:

John D. Lewis "The Development of the Theory of Tyrannicide to 1660"

لە بەرهەمی هاوبەشی

Oscar Jaszi and John D. Lewis. Against the Tyrant: the Tradition and theory of tyranincide (Glencoe. Ill.: the Free press. 1957), pp.3-96, esp.pp.3ff. 20ff.

٢٥ـ ل ٦٤

٢٦ـ ل ٦٥

٢٧ـ مەسنار دەنووسێت: ((ئەگەر لابۆتی لەنێوان مۆنارکی (پاشایەتی) و ستەمکاری هیچ جیاوازیەك ناکات (ئەو تاوانانەی کە بۆنیفۆن دەداتە پاڵ لابۆتی)، لەبەر ئەوەیە کە هەردوویان بە بۆچوونی ئەو ناڕەوان و مۆنارکی، لە راستیدا جۆرێکی تایبەتی چەوساندنەوەیە.))

Mesnard, op.cit, pp..395-6.

لابۆتیش لەو شوێنەی کە دەپرسێت ئایا مۆنارکی شوێنێکی لە نێو بەرژەوەندیە راستەقینەکانی عامەی خەڵکدا هەیە یاخود نە، سەرەتا رەخنەی لێدەگرێت، ((چونکە بەزەحمەت دەتوانین باوەڕ بکەین لە وڵاتێکدا کە هەموو شتێکی پەیوەستە بە گەورەیەك، شتێك بەناوی بەرژەوەندی عامە هەبێت.)) ل ٥٤

٢٨ـ ل ...



٢٩ـ ل ٥٤

٣٠ـ ل ٦٥

٣١ـ ل ٦٧

٣٢ـ لاپەڕەکانی ٧٠ـ ٧١

٣٣ـ دەیڤد هیۆم دواتر لە وتارەکەیدا ((لەبارەی بنەچەی حکومەت)) نووسیویەتی: ((خوو هۆکارێکە بناغە ناتەواوەکانی سروشتی مرۆیی خێرا سەقامیگر دەکات؛ مرۆڤەکانیش هەر لەگەڵ ئەوەی کە خوو بە گوێڕایەڵی و فەرمانبەریەوە دەگرن، هەرگیز بیر لە رەتکردنەوەی یاخود رزگاربوون لێی ناکەن، چونکە ئەوان بەردەوامی بەرێگەی باپیرانیان دەدەن...))

٣٤ـ ل ٧٩

٣٥ـ ل ٨١

٣٦ـ ل ٨٢

٣٧ـ ل ٨٣

٣٨ـ ل ٨٥

٣٩ـ ل ٨٤

٤٠ـ هەمان لاپەڕە.

٤١ـ لاپەڕەکانی ٨٤ ـ ٨٥ بۆنیفۆن سوودی لەم دەرفەتە وەرگرتووە، لابۆتی سەرەڕای مەیلە توندڕەوەکانی، بە پارێزگارێکی رەسەنی فەرەنسی ناو دەبات: ((لابۆتی چونکە مەبەستی نەبوو هێرش بکاتە سەر ئەو سستەمەی لە ئارادا بوو، ئەوا بەشێوەیەکی فەرمی و بەتەواوی رێزەوە ئەو چاوەڕوانیانەی لە پاشای هەبوون، بەیانی کردوون.))

Bonnefon, op.cit. p.xLi.

هەروەها بڕوانە رەخنەی هەڵەلێکدانەوەی بۆنیفۆن، نووسراوی مەسنار (p.398, op.cit.)

٤٢ـ ل ٧٩

٤٣ـ لاپەڕەکانی ٦٢ـ ٦٥

٤٤ـ ل ٨٦

٤٥ـ ل ٨٧

٤٦ـ لاپەڕەکانی ٨٧ـ ٨٨ جۆن لویس پێیوایە کە: لابۆتی لێرەدا پەنجە بۆ گرنگترین رەگەزی ستەمکاری درێژ دەکات کە لە دیدی نووسەرانی پێش ئەو و دوای ئەو دا بەشاراوەیی ماوەتەوە.

Lewis. op.cit. p.56.

٤٧ـ لاپەڕەکانی ٨٨ـ ٨٩.

٤٨ـ ل ٧٢

٤٩ـ ل ٢

٥٠ـ هەمان شوێن.

٥١ـ لاپەڕەکانی ٧٦ـ٧٧

٥٢ـ لاپەڕەکانی ٨٨ـ ٨٩

٥٣ـ بڕوانە ئەنجامە بڕیارانەکەی لە بەرهەمی مەسنار (p.404، op.cit.)دا و هەروەها بڕوانە:

Oscar Jaszi" ،The Use and Abuse of Tyrannicide"

لە بەرهەمی هاوبەشی یاس و لویس (pp.254، op.cit.)

54-Mesnard، op.cit. p.400

55-Memoir Concerning the Edict of January، 1562 .(بەرهەمی لابۆتی) بگەڕێوە بۆ:

Frame، op.cit. pp.72-3، 345.

56-Mesnard، op.cit. pp.405-6.

٥٧ـ بڕوانە بەرهەمی:



J.H.M. Salmon، the French Religious wars in English political Thought (Oxford: Clarendon press، 1959)، p.19n

٥٨ـ بەرگی سێیەم(١٥٧٦) Memories de Lestat de France بڕوانە:

Bonnefon" ،Introduction"، op.cit. pp.xlix-l.

59-Laski، op.cit. p.24.

60-Lysander Spooner، No Treason: the Constitution of No Authrity (Colorado Springs، Co.: Ralph Myles pub.، 1973)، p.18.

61-Cecilia Kenyon" ،Men of Little Faith; the Anti-Federalists on the Nature of Representative Government" ،William and Mary Quarterty (1955)، pp.3-46.

## سیاسەتی ملکەچی:
## نامەیەك لەبارەی خۆبەکۆیلەکردنەوە



### بەشی یەکەم

ملکەچی کردنی چەندین گەورە پیاوان بەکارێکی باش نازانم، لێگەڕێ
با تەنیا سەروەرێکمان هەبێت، بهێلە تەنیا یەك کەس پاشایەتی بکات.

هۆمەر ئەم دێرانە لەبەرامبەر خەڵکدا لە زمانی ئۆلیسەوە (١) بەیان دەکات، ئەگەر ئەو تەنیا رستەی یەکەمی بەسەر زماندا هاتبا، گوتەیەکی پەسەندی گوتبوو. بەپێی لۆژیك، دەبو ئاماژە بەوە بکات کە حکومەتی فرەگەورە لەو رووەوە بەچاوێکی نزم تەماشای دەکرێت کە هەر مرۆڤێك تەنیا بەوەی نازناوی «گەورە»ی دەستکەوێ گەندەڵ دەبێت و لەڕێگای ئەقڵ لادەدات. بەڵام لەجیاتی ئەوە، هۆمەر قسەیەکی ناماقووڵی خستووتە سەر زمانی پاڵەوانەکەی «بهێڵە تەنیا یەك گەورەمان هەبێت، بهێڵە تەنیا یەك کەس پاشایەتی بکات.» ناتوانین رەخنە لە ئۆلیس بگرین، چونکە لەو هەلومەرجەدا ئەو ناچار بووە ئەم گوتانە بڵێت تاکو رێ بگرێت لە گریمانەی بەرپابوونی شۆڕش لەناو سوپاییەکاندا و بەبڕوای من، ئەو لێرەدا حەقیقەتی کردۆتە قوربانی بەرژەوەندی. بەهەرحاڵ گوێڕایەڵیکردن لە فەرمانی یەك «گەورە» جۆرێکە لە بەدبەختی، چونکە چاوەڕوانی کردنی میهرەبانی لێی چاوەڕوانیەکی بێ هودەیە؛ لەبەر ئەوەی ئەو بەپێی پێویستی دەسەڵاتەکەی، هەرکات حەزبکات بێ بەزەیی دەبێت. هەر بەمجۆرەش هەبوونی فرەگەورە چەندین جار بەدبەختانەترە. هەڵبەت مەبەستم ئەوە نییە سەبارەت بەم مەسەلە شوێن تێڕامان و جێی ناکوکیە، واتە پەسەندکردنی جۆرەکانی دیکەی حکومەت لەجیاتی پاشایەتی (٢)

قسە و باسێك بكەم. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، بەر لەوەی دوودڵ بین لە ئاست پێگەی پاشایەتی لەناو میللەت و ئێتنۆسەکاندا، حەز دەکەم بزانم ئایا پاشایەتیش دەچێتە ریزی ئەو دەستەیەی حکومەتەکانەوە یان نەخێر؛ چونکە زۆر ئەستەمە بتوانین باوەڕبکەین لە سەرزەمینێکدا کە هەموو شتێکی پەیوەستە بە تاکەکەسێکەوە؛ نیشانەیەك لە خۆشگوزەرانی و بەختیاریی گشتی بدۆزرێتەوە. هەڵبەت قسەکردن لەم بارەیەوە دەرفەتێکی دیکەی دەوێت، چونکە بێ گومان دەمانخاتە سەر چەندین جۆری قسەکردنی سیاسی. وەلێ لەم باسە کورتەدا، تەنیا دەمەوێ بزانم ئەوە چۆنە کە ئاپۆرەیەك لە مرۆڤەکان، گوندەکان، شارەکان و میللەتەکان، هەندێ کات لە ژێرباری دەسەڵاتی زۆردارێك ئەشکەنجە دەچێژن کە هیچ دەسەڵاتێکی نییە، جگە لەو دەسەڵاتەی کە خودی خەڵك پێیان بەخشیوە؛ زۆردارێك کە دەتوانێت تەنیا تا ئەو سنووره ئازاریان بدات کە توانای بەرگەگرتنیان هەیە؛ستەمکارێك کە بەهۆی هەدادانی خەڵك و بێ مەیلی ئەوان لە ئاست بەرەنگاربوونەوەدا ئەگەری ئەوەی بۆ دەرەخسێت هەر ئازارێکیان پێ بگەینێت و هەر ستەمێکی پێی خۆشە لەسەریان بەڕەوا بزانێت. بەڕاستی دۆخێکی سەرسوڕهێنەرە ! لەگەڵ ئەوەشدا بینینی یەك ملیۆن مرۆڤ لە بەدبەختی و بێچارەییدا هێندە ئاساییە کە لەجیاتی ئەوەی سەرسوڕهێنەر بێت زێتر جێگەی داخە. هەزاران مرۆڤ کە لە ژێر کۆت و بەندی یەك کەسدا دەژین و سەرقاڵی بەردەوامیدان و گەشەدانن بەم دۆخە و وا دەردەکەوێ کە خوشحاڵ بن بە ناو و پێگەی ئەم تاکەکەسە، ئەو کەسەی کە پێویست ناکات لە دەسەڵاتەکەی بترسن. چونکە ئەو تەنیا کەسێکە بەهۆی رەفتارە خوێنرێژ و دژەمرۆییەکەیەوە هیچ فەزیلەتێکی نییە کە بکرێ ستایشی بکەین و بەباڵایدا هەڵبڵێین.



یەکێك لە تایبەتمەندیە سپڵەکانی چەشنی مرۆڤ ناچاربوونیەتی بۆ ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانیەتی لەبەرامبەر ستەمدا. ئێمە ناچارین خۆ بەدەستەوە بدەین؛ چونکە ناتوانین بەهێزتربین. بەم پێیەش، هەر کاتێك چارەنووسی میللەتێك لەمیانەی جەنگێکدا، دەیانکاتە ئەڵقەلەگوێی کەمینەیەکی زۆردار، هەروەك چۆن شاری ئەسینا ملیان لەبەرامبەر سی زۆرداردا کەچ کرد (٣) ئەوە نابێت لە ملکەچی میللەتان سەرمان بسوڕمێ، بەڵکو دەبێ داخی بۆ بخۆین. بە دەستەواژەیەکی دیکە، لەجیاتی سەرسوڕمان دەبێت بە هەدادانەوە بەرگەی زۆردار بگرین و هیوامان بە ئاییندەیەکی باشتر هەبێت.

سروشتی مرۆڤ وایە بەشی زۆری ژیانی ئەو لە پەیوەندیدا بەکەسانی دیکەوە دەگوزەرێت. لە سروشتی ئێمەدایە کە حەزمان لە چاکەیە، رێز لە باشیەکان دەگرین و چاکەخوازی لە هەر سەرچاوەیەکەوە هەڵقووڵا بێت بەچاوی منەتەوە لێی دەڕوانین و، بەزۆری ئاسایش و ئارامی خۆمان دەکەینە قوربانی و دەیخەینە بەرپێی ئەو کەسە کە خۆشمان دەوێت و ئەو بە شایانی ئەو خۆشەویستیە دەزانین، بۆیە، ئەگەر میللەتێك کەسێك بدۆزێتەوە کە لە هەلومەرجە ترسناك و هەستیارەکاندا بە کەمترین دووربینی و دلێری و هەستی بەرپرسیاریەوە بۆ بەرگری کردن لە میللەت هەستاوەتە سەرپێ و ئەوانی سەربەرز کردووە، هەر لەبەرئەوەش، خوو بگرن بە پەیڕەوی کردن لەو و تا ئەو ڕادەیە پەیوەست بن پێیەوە کە لە پلەی حکومەتدا داینێن و مافی فەرمانڕەوایی کردن بە شایانی ئەو بزانن، بەدوور دەزانم ئەم پرۆسەیە هەڵسەنگێنراو و ئاقڵانە بێت. چونکە لەو کاتەدا، کەسێك کە لە پێگەی خۆیدا دەتوانێت چاکە بکات، بۆ پلە و پایەیەك بەرزکراوەتەوە کە لەوانەیە لە جیاتی چاکە ستەم بکات. هەڵبەت تا ئەو کاتەی ئەو درێژە بە چاکە و راستی و دادپەروەری بدات نابێت

ترسمان لێ بنیشێت؛ چونکە ئەو هەڵبژاردنە، هەڵبژاردنێکی دروست بووە.

بەڵام ئەی خوای گەورە! ئەوە چ دیاردەیەکی سەیرە؟ دەکرێ چ ناوێکی لێ بنێین؟ ماهیەت و جەوهەری ئەم بەدبەختیە چییە؟ ئەمە چ پیسی و، رەنگە خراپتر لەو، چ زەبوونیەکە؟ بینینی ئاپۆرەکانی خەڵك کە نەك تەنیا گوێڕایەڵی دەکەن بەڵکو بۆ کۆیلایەتی کردن رەپێش خۆ دراون؟ خەڵکانێك فەرمانڕەواییان بەسەردا ناکرێت بەڵکو دەکەونە ژێر ئیستبدادەوە؟ ئەم بەخت رەشانە، نەسامانێکیان هەیە، نە خزمانێك، نە هاوسەرێك و نەنەوەیەك و نەژیانێك ئەگەر بتوانین ناوی لێ بنێین ژیان - کە هی خۆیان بێت.

ئەوان هەڕاج دەکرێن، دەبنە جێی پێ رابواردن و بەدبەخت دەکرێن. نەك لەلایەن سوپاوە، یاخود گروپێکی درندەوە، بەڵکو لەژێر کۆنترۆڵی تاکەکەسێکدا؛ نەك هەرقل یان شەمشۆن، بەڵکو لەلایەن مرۆڤێکی سادە و ئاسایی و بچووك، کە زۆربەی کاتەکان ترسنوکترین و لاوازترین مرۆڤە. کەسێك کە هەرگیزا و هەرگیز بەشداریی لە شەڕێکەدا نەکردووە؛ کەسێك کە لە پاش رکابەرییەکەوە دەرناکەوێت؛ کەسێك کە هێزی بەکارهێنانی زەبر و توانای رێنمایی کردنی خەڵکی نییە؛ کەسێك کە تەنانەت بۆ خەوتن لەگەڵ ئافرەتێك، خاوەنی هێزێکی جەستەیی پێویست نییە! ئایا دەتوانین ترس بە هۆکاری ملکەچی کردن لە کەسێکی ئاوا لەقەڵەم بدەین؟ ئایا دەتوانین بڵێین خزمەتکارەکانی ئەو ترسنۆك و بێ دڵ و بێ جورئەتن؟ ئەگەر دوو، سێ، یان چوار کەس لەبەرامبەر کەسێکدا راست نەبنەوە دەڵێین شتێکی سەرسوڕهێنەرە؛ بەڵام بەهەرحاڵ شیاوی هەرسکردنە؛ لەبارێکی ئاوادا دەتوانین بڵێین نەبوونی ئازایەتی، یان ترس، بەسەر ئەو چەند کەسەدا زاڵ بووە. بەڵام ئەگەر سەدان و هەزاران کەس



بەرگەی زۆرداری و چاوبرسیەتی کەسێك بگرن، ناکرێ بەو ئەنجامە بگەین کە هەموویان ترسنوك و بێ جەرگن؛ بەڵکو پێویستە بڵێین نایانەوێت لەبەرامبەریدا بوەستن، بۆیە ترسنوك نین بەڵکو بێباکن. کاتێك هەزاران و بگرە ملیۆنان کەس، خۆیان دوور بگرن لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کەسێك کە جگە لە ستەم و دیلی و نادادپەروەری لەسەر خەڵك شتێکی دیکەی نییە، دەکرێ چ ناوێك لەمە بنێین؟ ئایا ئەمە ترسە؟ هەموومان دەزانین کە پۆخلەیی و شەڕانیەت سنوورێکی هەیە کە ناکرێ ببەزێنرێت. لەوانەیە دوو یان دە کەس لە کەسێك بترسن، بەڵام کاتێك سەدان، هەزاران و ملیۆنان کەس لەبەرامبەر باڵادەستی کەسێك ناوەستنەوە و بەرگری لە خۆیان ناکەن، ناتوانین ناوی بنێین ترس؛ چونکە ناکرێ ترس بەم ئەندازەیە بێت، بە هەمان شێوەی کە ئەگەر کەسێك بیەوێت لەبەرامبەر سوپایەك بوەستێت یاخود پاشایەتیەك لەناوببات، نیشانەی ئازایەتی ئەو نیە. کەواتە ئەوە چ پیسیەکی هیولانییە کە تەنانەت وشەی ترس هەڵناگرێت. پیسیەك کە هیچ ناوێك بۆ ئەو نیە، سروشت نیشانەیەکی ئەومان پیشان نادات، زمانەکانمان لە بەیانکردنی ئەمەدا کورت دێنن؟ ئەگەر لەلایەکەوە پەنجا هەزار پیاوی شەڕکەر و لەلای بەرامبەریشدا بەهەمان ژمارە پیاوی چەکدار رووبەڕووی یەکتر وەستابن و لە نێوانیاندا شەڕێك دروست ببێت کە لایەکیان بۆ پارێزگاری کردن لە ئازادی و لای بەرامبەر بۆ پێشل کردنی ئازادی بجەنگن، بەبڕوای ئێوە کام لا سەردەکەوێت؟ بەبۆچوونی ئێوە کامەیان ئازاتر هەڵمەت بەرێت و بچێتە پێشەوە؟ ئەوانەی کە بۆ پێشوازی کردن لە ئازادی هەنگاو دەنێن یان ئەوانەی کە جگە لە ئازادی و بەدیل گرتنی ئەوانی دیکە نیەتێکی دیکەیان نیە؟ لایەکیان بەهرەکانی جاران و هیوا بە داهاتوویەکی شاد و هاوشان بە خۆشبەختی لەبەرامبەر خۆیدا دەبینێت؛ بیر لە منداڵ و نەوەکانی داهاتوو دەکاتەوە؛ ئەم بیر و هزرانە

دەرد و ئازارەکانی جەنگ لە زەینیان دوور دەخاتەوە. لایەکەی دیکە، هیچ سەرچاوەیەکی سرۆشبەخشی نییە تا ئازایەتی خۆی بەهێز بکات. تاکە پاڵنەری ئەوان چاوچنوکی و چاوبرسیەتیە کە ئەویش لە بەرامبەر مەترسیدا بێ کاریگەر دەبێت و هەرگیز ناگاتە ئەو ڕادەیەی بتوانێت تەنانەت ترسی بینینی ڕژانی دڵۆپە خوێنێك لە برینێ نەهێڵێت. بیر لە شەڕی دادپەروەرانەی *میلیتادیس*، (٤) *لیۆنیداس*، (٥) *تمیستۆکلس*(٦) بکەرەوە؛ ئەو شەڕەی کە یۆنانیەکان لەبەرگریکردن لەخەڵك و سەرزەمینی خۆیان ئەنجامیان دا و هێشتا لە یادەوەری پیاوانی ئەمڕۆدا هێندە نوێیە وەك بڵێی هەر دوێنێ ڕوویداوە. ئەم شەڕە، بەیەکێك لە جەنگە نموونەییەکان لە سەرتاسەری جیهاندا لەقەڵەم دەدرێت. بیردەکەنەوە چ هێزێك توانا و ئازایەتی ڕاوەستان لە بەرامبەر گەورەترین کەشتیەکانی بەم چەند پیاوە بەخشیبوو! لە جەنگێکدا کە تەنانەت دەریاکان گریان گرت؟ ئازایەتی شەڕکردن لەگەڵ سوپایەك کە سەدان جار هێندەی سەربازە یۆنانیەکان بوو؟ ئایا جگە لەوەی کە ئەم شەڕە نەشەڕی یۆنانیەکان لەگەڵ ئێرانیەکان بەڵکو سەرکەوتنی ئازادی بوو بەسەر دیلی و زاڵبوونی ئازادی بوو بە سەر باڵادەستی و چاوبرسیەتی و چاوچنۆکیدا؟

راقەی ئەو پاڵەوانیتیانەی کە ئازادی لە دڵی ئازادیخوازاندا دەوروژێنێت، سەرسوڕهێنەرە؛ بەڵام چ کەسێك هەواڵی ئەو شەڕانەی هەموو ڕۆژێك لە نێوان خەڵکی هەندێك لە وڵاتان ڕوودەدەن، باوەڕدەکات؟ بەراستی کێ باوەڕ دەکات کەسێك بتوانێت فەرمانڕەوایی بە سەر سەدان هەزار کەسدا بکات و ئەوان لە ئازادی بێ بەش کات؟ کێ لە ئێمە تا لە نزیکەوە شایەدی ئەو راستیە نەبین باوەڕی پێ دەکەین؟ ئەگەر ئەم رووداوە لە سەرزەمینە دوورەدەستەکان ڕوویدات و بۆ ئێوەی بگێڕنەوە،



ئەوە کێیە بە ئەفسانە و چیرۆکی نەزانێت؟ بێ گومان، بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم کەسەدا، پێویست بە شەڕ ناکات، چونکە ئەگەر هەموو خەڵکی ڕوو لە دیلەتی خۆیان وەرگێڕن و خۆدووربگرن، ئەو خۆبەخۆ ژێر دەکەوێت: لەبنەڕەتدا پێویست ناکات شتێکی لێ بسەنین، ئەوەندە بەسە شتێکی پێ نەبەخشین؛ پێویست ناکات خەڵکی بۆ ڕزگارکردنی خۆیان دەست بدەنە کارێك: تەنیا پێویستە لەسەریان لە دژی خۆیان هەنگاوێك نەنێن. کەواتە، ئەوە خەڵکەکەیە خۆی بە بەستنەوە و ملکەچی دەسپێرێت، چونکە هەر کاتێك بڕیار بدەن کە گوێڕایەڵی نەکەن، کۆتاییان بە کۆیلایەتی خۆیان هێناوە. نەتەوەیەك کاتێك لە نێوان کۆیلایەتی و ئازادیدا، یەکەمیان هەڵبژێرێت، ملی خۆی بەتیغ سپاردووە و کۆتی خستووتە گەردەنی خۆی، ڕەزامەندی خۆی لە بەرامبەر لەناوچوون و بەدبەختی خۆیدا پیشانداوە و بۆ پێشوازیکردن لێی چۆتە پێشەوە. ئەگەر باڵاترین بەها دووبارە وەرگرتنەوەی ئازادیە، من ئامۆژگاری نەتەوەکان ناکەم لەم ڕێگایەدا هەنگاوێك بنێن. هەرچەند هیچ کارێك بەنرختر لە گێڕانەوەی مافی سروشتی مرۆڤ ـ ئەگەر بتوانین بڵێین، گەڕانەوە لە باری ئاژەڵێکی بارهەڵگر بۆ مرۆڤ ـ نیە. من چاوەڕێی ئازایەتی و بێباکیەکی ئەوتۆ لەو مرۆڤە ناکەم؛ لێگەڕێ لەجیاتی ئەوەی بەهیوای نادڵنیانەی ژیانێکی بەختیاردا بسووتێت، با لە لەناوچوون و ئاسایشی درۆزنانەی خۆیدا بژیت. ئەوکات چ دەبێت؟ ئایا بۆ بەدەستهێنانی ئازادی جگە لە ئارەزووکردن و هیوابوون بەو (ئازادی) پێویستی بە هیچ شتێکی دیکە نیە؟ ئەگەر تەنیا بڕیاردان و ویستێکی کەم پێویستە، ئەو کات ئایا نەتەوەیەك لەجیهاندا هەیە ئامادە بێت لە ڕێگەی ئازادی و دووبارە وەرگرتنەوەی مافە پێشێلکراوەکانیدا خوێنی خۆی برێژێت؟ ئەو مافەی کە نەبوونی هانی بدات مردن بەباشتر لە ژیان بزانێت؟

هەموو مرۆڤێك دەزانێ ئەو ئاگرەی لە پریشکەیەکی بچووکەوە هەڵدەستێ تا ئەوکاتەی دارێك هەبێ بسووتێ بە بڵێسەداری دەمێنێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، تەنانەت ئەگەر ئاگرەکە بەئاویش نەکوژێنرێتەوە، ئەوکاتەی شتێکی نەما بۆ سووتان دەکوژێتەوە و چیدی بڵێسە نادا. بەهەمان شێوەش هەرچەندە زۆرداران زێتر تالانی بکەن، چاوچنۆکتربن، زێتر کاولکاری و وێرانی بکەن، ژمارەیەکی زۆرتر خۆیان دەدەنە دەست و ملکەچیان دەبن. بەمجۆرەیە کە ستەمکارە فەرمانڕەواکان، بەهێزتر و ترسناکتر دەبن و زێتریش ئامادە دەبن بۆ تارومار و وێرانکردن، بەڵام ئەگەر کەسێك خۆی نەدا بەدەستەوە و بێ هیچ توندوتیژیەك، تەنها ملکەچیان نەبێت، بێ پەنا، بێ پاسەوان، رووت و قووت و بەدەستی بەتاڵ دەمێننەوە و دەگۆڕێن بۆ «هیچ»؛ هەر بەو جۆرەی ئەگەر ئاو و خۆراك نەگاتە رەگی رووەکێك لاسك و گەڵاکانی سیس دەبن و وشك هەڵدەگەڕێن.

چاونەترسەکان لەپێناوی گەیشتن بە ئارەزووە باشەکان سڵ لە مەترسی ناکەنەوە؛ پیاوانی زیرەك و بیرتیژ لە بەرگەگرتنی رەنجکێشان خۆنادزنەوە، ئەوە تەنیا ترسنۆك و دەبەنگەکانن نەتوانایان هەیە بەرگەی سەختیەکان بگرن و نەدەشتوانن لەپێناو بەرگریکردن لە مافی خۆیان هەستنە سەرپێ؛ ئەوانە تەنیا لە ئاستی ئارەزوو و خواست و خوزگە هەڵکێشاندا دەمێننەوە، هەرچەندەش ئەم ئارەزووە بە بەردەوامی لە جەوهەری ئەواندا ماوەتەوە، وەلێ بوێری درکاندن یاخود خەباتکردنیان لەپێناویدا نیە. ئەم ئارەزووە هەم لە دڵی ئاقڵەکان و هەم لە دڵی نەزاناندا، هەم لە هزری پیاوانی بە جەرگ و هەم لە زەینی کەسانی ترسنۆکدا شەپۆل دەدات. ئەو ئارەزووەی کە ئەگەر بێتەدی هەردوو گروپەکە دەگەینێت بەوپەڕی دڵخۆشی. بەڵام وا دەردەکەوێت لێرەدا، هۆکارێك ونە. من نازانم ئەوە چۆنە کە سروشت، مەیلی سووتێنەری



ئازادی، ئەم بەهرە قووڵەی، لە دڵی مرۆڤەکاندا جێ نەکردۆتەوە؟ بەهرەیەك کە کاتێ لەدەست دەردەچێ، زۆردارەکان دێنە مەیدانەوە و ئەو رێژەیەش لە بەهرە کە دەمێنێتەوە لەبەر لاوازبوونی بەهۆی کۆیلایەتیەوە، بێ کاریگەر دەبێت. ئازادی تەنیا بەختەوەرەیەکە کە مرۆڤەکان لەسەری سورنین؛ چونکە ئەگەر لەسەری سوربوونایە، بەدڵنیاییەوە بەدەستیان دەهێناو دەیانپاراست. وەك دەردەکەوێ ئەوان ئەم ئیمتیازە بێ نموونەیەیان لەبەر ئەوە نەویستووە، چونکە زۆر ئاسان بەدەست دێت.

ئەی هەژارەکان، بەختڕەشەکان، ئەی ئەوکەسانەی لە نەزانیدا ژیان دەبەنە سەر! ئەی ئەو نەتەوانەی خۆتان هۆکاری بەدبەختین و چاوتان لە مافەکانتان پۆشیوە! ئێوە بەدیار چاوی خۆتانەوە، خۆتان لە باشترین و زۆرترین پشکی سامانی خۆتان بێبەش دەکەن؛ مەزراکانتان تالان دەکرێن، سامانەکەتان دەدزرێ، میراتی بنەماڵەییتان لەناودەچێ؛ بەو جۆرە دەژین کە ناتوانن بانگەشەی خاوەندارێتی هیچ شتێك بکەن؛ وا دێنە پێش چاو بەوەی کە ئێوە دارایی و خێزان و ژیانتان بەقەرز وەرگرتووە رەزامەند و خۆشبەختن.

ئەم گەندەڵی، بەدبەختی، وێرانی و لەناوچوونە نەك لە دوژمنێکی بێگانەوە، بەڵکو لە دوژمنێکەوە بە ئێوە دەگا کە خۆتان دەسەڵاتتان پێ بەخشیوە؛ ئەو دوژمنەی کە لە پێناویدا دەچنە جەنگ و دەکوژرێن و لە بەرخاتری شانازی و سەربڵندی ئەو لە گیانی خۆتان دەبورن. ئەو کەسەی کە فەرمان بەسەر ئێوەدا دەردەکا تەنیا دووچاو، دوودەست و جەستەیەکی هەیە نەك زێتر. تەنانەت ئەو هیچ شتێکی زێتری نییە لەوەی کە خراپترین مرۆیەکانی نیشتەجێی ناو شار و وڵاتەکانتان هەیانە؛ لە راستیدا هیچ شتێکی نییە جگە لەوەی ئێوە پێتان بەخشیوە تا لەناوتان ببات. ئەگەر ئێوە چاوی پێ نەبەخشن، ئەو ئەم هەموو چاوەی لەکوێ بوو

تائێوە بخاتە ژێر چاودێرییەوە؟ ئەگەر خۆتان دەست و بازووی نەدەنێ، ئەو ئەم هەموو بازووەی لەکوێ بوو تا ئێوەی پێ سەرکوت بکات، ئەگەر خۆتان پێی پێ نەبەخشن چۆن و بەکام پێیانەی لەتوانای دایە شارەکانتان پێماڵ کات؟ ئەگەر خودی ئێوە دەسەڵاتی نەدەنێ، ئەو چۆن دەتوانێ فەرمانتان بەسەردا دەرکا؟ ئەگەر هاوکاری نەکەن چۆن دەوێرێت بەگژتاندا بچێتەوە؟ ئەگەر ئێوە هەل بۆ دز نەڕەخسێنن، چۆن دەتوانێ تالآنتان کات؟ ئەگەر دەستان لەگەڵ دەستی بکوژدا نەبێ، چۆن دەتوانێ بتان کوژێ؟ ئێوە دەچێنن و ئەو دەیماشێتەوە؛ ئێوە ئامراز و کەرەستەیماڵەکانی خۆتان بەزەحمەت پەیدا دەکەن و ئەو بە تاراج دەیانبات؛ کیژۆڵەکانی خۆتان بە خوێنی دڵ گەورە دەکەن تا ببنە هۆکاری شەهوەتپەرستی ئەو؛ کوڕەکانتان لە پێناوی ئەودا دەنێرنە جەنگ و دەیانکەنە خزمەتکاری ئەو؛ جەستەی خۆتان دەخەنە بەردەستی تا کارکوشتەی کات و ئەنجامی سوودی کارەکەی ئێوەش لە عەیش و نۆش و هەوەسبازیدا بەکاربهێنێ، وزەی خۆتان دەکەنە ئاو تاکو ئەو بەهێزتر و بەهێزتر بێت و لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا لە پەلوپۆتان خات. ئێوە دەتوانن خۆتان لەم خۆبەکەمزانی و پیسیە رزگار بکەن؛ خۆبەکەمزانیەك تەنانەت چوارپێکانیش بەرگەی ناگرن؛ ئەمەش بێ ئەوەی کە هیچ هەنگاوێك هەڵبێنن، تەنیا ئەوەندە بەسە خواستی ئازادیتان هەبێت. هەرکات بڕیار بدەن کە چیدی کۆیلە نەبن، یەکسەر ئازاد دەبن. ناڵێم بەزۆری بازوو زۆردار بڕوخێنن؛ بەڵکو دەڵێم تەنیا بەسە کە کۆتایی بەپشتیوانی لێ کردنی بێنن، ئەوکاتە دەبینن چۆن چۆنی کۆڵەکەی ئەم پەیکەرە مەزنە دەلەرزێ و سەراوژێر دەبێت.



## بەشی دووەم

پزیشکەکان بڕوایان وایە نابێت دەست لەو برینانە بدەین کە چارەسەریان نیە، بێ دوودڵی ئەم ئاگادارکردنەوەیەیان راستە. بەڵام رەنگە نابەجێ بێت ئەگەر ئامۆژگاری نەتەوەیەك بکەم کە هەستیاری خۆی سەبارەت بە دەردو و نەخۆشیە کوشندەکەی لە دەست دابێت.. کەوابێ وەرن بگەڕێین تا تێبگەین کە چۆن مەیلی گوێڕایەڵی و ملکەچی لەنێو میللەتاندا ریشەی داکوتاوە بە جۆرێك کە چیدی داواکردنی ئازادی بە شتێکی سروشتی نازانن.

هەموو پشتگیری لەوە دەکەن کە مرۆڤ بەپێی سروشت و خووی خۆی لەسەرەتاوە گوێڕایەڵی دایك و باوکە، ئینجا هێواش لەپاش گەشەی ئەقڵی و پێگەیشتنی هزری، چیدی نابێتە ملکەچ و بەندەی هیچ کەسێك. سەبارەت بەوەی کە ملکەچی بۆ دایك و باوك شتێکی خۆڕسکە و لە رەمەکەکانماندا بوونی هەیە گومانێك نییە و هەموو ئەوەمان قەبووڵە کە پەیڕەوی لە نموونەیەك دەکەین. بەڵام ئەوەی کە ئایا هەر لە سەرەتای لە دایکبوونەوە ئێمە خاوەنی ئەقڵین، پرسیارێکە زانا و فەیلەسوفانی قوتابخانە جۆربەجۆرەکان لەبارەیەوە زۆر تێڕاماون و گفتوگویان کردووە. وا هەست ناکەم هەڵەم کردبێت ئەگەر بڵێم لە جەوهەری مرۆڤدا تۆوێك هەیە لە ئەقڵ کە زگماکیە و ئەگەر بە دروستی پەروەردە بکرێت بەردەگرێت و بە پێچەوانەیشەوە، ئەگەر نەتوانێ لەبەرامبەر رەزیلەت و

پیسییەکاندا بەرگری بکات بەدیهیتر نییە کە سروشت، ئەو خزمەتکارەی یەزدان و ئەم فەرمانڕەوایە بەسەر مرۆڤەوە، هەموومانی لە خاکێك دروست کردووە تاکو بەچاوی دۆستی و برایەتی و هاوکارییەوە بڕوانینە یەکتر. ئەگەر سروشت توانای جەستەیی یان روحیی زێتری بەهەندێکمان بەخشیوە، بەمەبەستی دروستکردنی جەنگ و ناکۆکی نەبووە؛ سروشت دەسەڵات و هۆشێکی زیاتری نەداوەتە کەسانێکی بەهێز و زیرەك تا بە هۆیانەوە، وەکو دڕندەکان پەلاماری لاوازەکان بدەن و ستەمیان بەسەردا بسەپێنین. ئەگەر سروشت بە هەندێك زێتر و بە ژمارەیەکی تر کەمتری بەخشیبێت، ویستویەتی هەلێك بۆ سەرهەڵدانی ئەڤینی برایانە بڕەخسێنێ تاکو ئەوانەی کە بەتوانان یارمەتی ئەوانە بدەن کە پێویستیان بە دەسگیرۆییە. کەواتە، لەبەر ئەوەی سروشت هەموو جیهانی کردۆتە شوێنی نیشتەجێبوون و حەوانەوەی ئێمە، ئەوە هەموومانی لەماڵێکدا نیشتەجێ کردووە، ئێمەیشی بە جۆرێك خوڵقاندووە تا کاتێك تەماشای یەکتر دەکەین نموونەی هاوبەشی خودی مرۆییمان لە سیمای یەکدیدا بناسینەوە؛ چونکە مەزنترین بەهرە، واتە توانای ئاخافتنی، بەهەموومان بەخشیوە تا لەگەڵ یەکدا پەیوەندیەکی برایانە چێبکەین و بەگۆڕینەوەی بیروڕا، پەیوەندیەکانمان پتەو کەین و خواستە هاوبەشەکانمان بێنینە زمان، هەروەها هەر لەبەرئەوەی لە هەموو نیشانەیەکی سروشتدا، جیلوەیەکی گشتی لە سروشتی مرۆڤ خەملێنراوە و ئامانج لەو خوڵقاندنەی لەو نیشانانەدا پەرچ کردۆتەوە، ئەوە بە دڵنیاییەوە پێویستە بڵێین ئێمەی مرۆڤ بەسروشت ئازادین، چونکە هەمووما ن ڕێبوارانی کاروانێکین. بۆیە نابێت لە زەینی هیچ کەسێکدا کەمترین دوودڵی لەو بارەیەوە هەبێت کە گوایە سروشت، هەندێکمانی لەسەرەتاوە بە کۆیلە خولقاندووە، چونکە ئەو گشت مرۆڤەکانی بەیەکسانی دروست کردوون.



کەواتە قسەکردن سەبارەت بەوەی ئایا ئازادی بنەمایەکی سروشتیە یان بەدیهاتووە، قسەکردنێکی بێهودەیە؛ چونکە ناتوانرێ هیچ مرۆڤێك بکرێتە دیل و کۆیلە مەگەر لەڕێی گومڕاکردن و هەڵخەڵەتاندنەوە بێت، لە دنیایەکدا کە سروشت بەسەریەوە فەرمانڕەوایە ـ واتە دنیایەکی پابەند بەئەقڵ ـ ناکرێت تیایدا هیچ جۆرە دژایەتیەك کە نیشانەی نادادپەروەری بێت بدۆزرێتەوە. لەبەرئەوەی ئازادی بەشێکە لە سروشتی مرۆیی، ئێمە نەك هەر تەنیا خاوەنی ئەو ئازادییەین، بەڵکو دەشمانەوێ بیپارێزین. ئێستا ئەگەر کەسانێك، خوای نەخواستە گومانیان لەم ئەنجامە هەیە ئەوەندە گومڕان کە ناتوانن ماف و ئارەزووە شەخسیەکانی خۆیان دەستنیشان بکەن، لەسەر منە ئەوەی پەیوەندی بەوانەوە هەیە ئاشکراکەم و ناڕەوایەتی ئەو ملۆزمە بێ رەحمانەی لەسەر تەختێ ئاشکرا بکەم. ئەگەر مرۆڤەکان کەڕ نەبن، نەعرەتەی «بژی ئازادی!» تەنانەت لە زمانی گیاندارە بێ هەستەکانیشەوە دەبیستن. زۆربەی ئەوانە کەمێك دوای دەستبەسەرکردن دەمرن: رێك وەك ئەو ماسیەی لە ئاو هاتبێتە دەر. بەڵام ئەمانە (مرۆڤەکان) چاوی خۆیان لە بەرامبەر رووناکی (راستی) بەستووە و هیچ حەزێك بۆ پاراستنی ئازادیی سروشتی خۆیان پیشان نادەن. گەر بڕیار بوایە ئاژەڵ و دڕندەکان زنجیرەیەکی پادشایانە بۆ خۆیان دامەزرێنن، رەسەنایەتی و ماقووڵیەتی ئەوان لەسەر بنەمای رادەی ئازادیخوازیەکەیانەوە دەستنیشان دەکرا. هەموو ئاژەڵەکان، لە بەهێزترینیان و گەورەترینیانەوە بگرە تا لاوازترین و بچووکترینیان، کاتێك بەداوەوە دەبن، بەجۆرێك بە هۆی چنگوور و ددان و دەندوك و سم و شاخ و ... بەرەنگاری داوەکە دەبنەوە کە هەر بینەرێ بە ئاسانی تێدەگات ئەوان لە پێناوی بەدەستهێنانەوەی ئازادیەکەیاندایە ئاوادەکەن، ئەگەریش لە داوی دەسبەسەری رزگاریان نەبێ، دەشێ ببینرێن چۆن لە حەسرەتی

ئازادبووندا دەژاکێن و غەمگین دەبن. ئەو ئاژەڵانە هەرگیز چێژ لە ژیانی دەستبەسەری و کۆیلایەتی وەرناگرن. چ روونکردنەوەیەك باشترە لە رەفتاری فیلێك کە بەداوەوە بووە و تا دوایین گەردی وزەی خۆی بەکاردەبات، پەلەکوتێ دەکات و عاجەکەی خۆی لە درەختەکان دەکوتێ و لە بێخەوە دەریاندەکێشێ تاکو رزگاری بێ لەدەستی راوچی؛ ئەمە رەفتارێکە هەستی ئاژەڵانەی ئەو بۆ ئازادبوون بەدیاردەخا، لەم رێگایەشدا ئەو عاجەکەی خۆی دەکاتە قوربانی و خوێنبایی ئازادیەکەی؟ ئێمە جوانوی ئەسپ لە هەوەڵی لەدایکبوونیەوە دەخەینە ژێر رکێفی خۆمان و خواردنی دەدەینێ و پەروەردەی دەکەین تا دەستەمۆ بێ و فەرمانەکانمان جێبەجێ بکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئاژەڵە هێندە بە زەحمەتی کەوی دەبێ کە هەموو جارێك گاز لە لغاوەکەی دەگرێت و لەگەڵ هەر دەست راوەشاندنێك، هەڵدەستێتە سەرپاشوو وەك ئەوەی بەزمانی بێ زمانی و بە جوڵە وانیشان بدات کە ئەم کارە نەك بەمەیل و خواستی خۆی، بەڵکو لەژێر باری زۆر و ناچاریدا ئەنجامدەدات. لەمە زێتر، دەکرێ چی بگوترێ؟

هەروەك ئەوەی ماوەیەك لەمەو پێش لە کاتی شیعر نووسینێکی گاڵتەدا بەفەرەنسی: گوتوومە:

تەنانەت گایەکانیش لەژێر قورسایی نیرەکاندا
سکاڵایانە، باڵندەکانیش لە قەفەسدا دەکرۆزێنەوە.

ئاخ، لۆنگا! بمبورن لەوەی ناتوانم شیعرەکانمتان بۆ بخوێنمەوە، چونکە دڵنیام دەستخۆشیم لێ دەکەن و ئەمەش لەمندا هەستی خۆپەسەندی دەجولێنێ. ئێستاکەش کە دەزانین ئاژەڵەکان، هەرچەندە بۆ ئەوە ئەفرێنراون تا خزمەت بە مرۆڤ بکەن، بێزارن لە دەستبەرسەری و



خوازیاری ئازادین و ناتوانن خوو بە دیلێتیەوە بگرن، ئەدی چی هاتووتە سەری ئەو مرۆڤەی یادەوەری رۆژانی بەرایی خۆی لە دەستداوە و مەیلی گەڕانەوەی بۆ ئەو یادەوەریە نییە؟

زۆرداران سێ جۆرن: هەندێکیان لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێرێن، هەندێکی دیکەیان بەزۆری تفەنگ و قشوونیعەسکەران لەسەر کورسی دادەنیشن، گروپێکی تریشیان ستەمکاریان بەمیرات بۆ دەمێنێتەوە. ئەوانە کە لە رێگەی شەڕەوە دەگەنە دەسەڵات ئەوەندە ژیرانە هەڵسوکەوت دەکەن کە هیچ کەسێك گومان ناکات ( ئەوان) سەرزەمینێکیان داگیرکردووە و فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکەن. ئەوانەی لە بنەماڵە پاشایەتیەکاندا دێنە دنیاوە، هیچیان کەمتر نییە لە زۆردارەکانی دی، چونکە لە مەمکی ستەمکاریەوە شیریان خواردووە و لەگەڵ ئەم شیرەشدا، خەسڵەتگەلی زۆردارێکیان بەمیرات بۆ بەجێ ماوە؛ ئەمانە وەها سەیری خەڵك دەکەن کە کۆیلەن و بە میرات بۆیان ماونەتەوە. لەرووی خووڕەوشت و تەبعی شەخسی و تاکەکەسیشەوە، جا دەستکراوە بن یان پیسکە، تەختی دەسەڵات و پاشایەتی بە بەشێك لە سامانی شەخسی خۆیان دەزانن. وەلێ ئەوەیان کە لە رێگەی خەڵکەوە دەگاتە دەسەڵات، ئەگەرچی وا دێنە پێشچاو کە هێمنتر و هەدادانیان زێترە، بەڵام کاتێ خۆی لەشوێنێکی باشتردا دەبینێتەوە و پلە و پێگەی گەورەیی و نفووز بەدەست دەهێنێ، دوورە دەست لە دەسەڵات هەڵبگرێ. فەرمانڕەواییێکی لەمجۆرە بەزۆری بڕیار دەدات ئەو حکومەتەی لەلایەن خەڵکەوە پێی سپێردراوە بکاتە میراتی خۆی و کاتێکیش میراتگرەکانی ئەم هزرەیان لا پەسەندبێت، بەجۆرێ رووەدەکەنە توندوتیژی و ستەم و بێ رەحمی کە پێش زۆردارەکانی دیکە دەکەون، چونکە ئەوان بۆ جڵەوکردنی خەڵك و سەپاندنی ستەمکاری، ناچارن پەنا بەرنە بەر زۆر و تۆقاندن،

یادەوەری ئازادی لە زەینی خەڵکدا بسڕنەوە و بەزۆریش لەم کارەدا سەرکەوتوو دەبن. قەبووڵمە لەنێوان ئەم سێ جۆر ستەمکاریەدا جیاوازی هەیە، وەلێ پێویستە بڵێم هیچ کامیان لەوی دیکە باشترنین. چونکە هەرچەندە شێوەی دەسەڵات گرتنەدەست لەهەر سێ بارەکەدا جیاوازە، رێگای حکومەت کردن بەکردەوە لە هەرسێکیاندا یەکە. ئەوانەیان کە هەڵدەبژێردرێن، بەجۆرێك لەگەڵ خەڵکدا دەجولێنەوە، وەك بڵێی خەریکی دەستەمۆکردنی گاکێویەکانن؛ ئەوانەیان کە بە زەبری شەڕەنێزە و چەك دەگەنە دەسەڵات، خەڵکی وەك دیلەکانی شەڕ گریمانە دەکەن، ئەوانەشیان کە میراتگرانی ستەمکارین، ئاپۆرەی خەڵك بەو کۆیلانە لەقەڵەم دەدەن کە لەگەڵ سامانەکانی دیکەدا بەمیرات بۆیان ماونەتەوە.

وەرن لەم بارەیەوە ئەو منداڵە تازە لەدایکبووانە بهێنینە پێش چاومان کە نە بە کۆیلەتی ئاشنان و نەبانگی یۆتۆپیای ئازادیان بەرگوێ کەوتووە، بەتەواویش بەم جۆرە وشانە نامۆن. ئەگەر داوا لەمانە بکرێت لە نێوان ئەم دووانەدا، واتە ئازادی و کۆیلەتی، یەکێکیان هەڵبژێرن، کامیان هەڵدەبژارد؟ گومانم نییە ئەوان فەزڵی ئازادبوون و ئەقڵی خۆیان دەدا بەسەر ملکەچی و جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەی لە ئارەزووی تاکەکەسێکەوە سەرچاوە دەگرن. تاکە ریزپەڕێك لەم بارەوە میللەتی بەنی ئیسرائیلە کە بەبێ هیچ جۆرە ناچارکردنێك یان پێویستیەك بۆ خۆیان ستەمکارێکیان هەڵبژارد (٧). هەرکاتێك مێژووی ئەم میللەتە دەخوێنمەوە ناتوانم جڵەوی تورەیی و هەڵچوونی خۆم بگرم، لەبەر ئەو رەزامەندی و خوشحاڵیەی ئەوان سەبارەت بەو هەموو خوێنڕێژی و درندایەتیەی لە نێوانیاندا ریشەی داکوتابوو شێت دەبم. بەڵام دڵنیام گشت مرۆڤەکان تا ئەو کاتەی بە مرۆڤ دەمێننەوە، واتە تاپێش ئەوەی خۆیان بەدەست کۆت و بەندەوە دەدەن؛ ئەگەری ئەوە هەیە یان بەزۆر یان بە



فێڵ و تەڵەکەبازی بە کۆت و داوی دەسبەسەریەوە دەبن؛ یاخود دەکەونە ژێر کۆنترۆڵ و داگیرکاری بێگانەوە، هەروەکو چۆن سپارتا و ئەسینا خۆیان دایە دەست هێزەکانی ئەسکەندەری مەکدوونی (٨) یاخود لەرێگەی گروپ و دەستە سیاسیەکانەوە؛ هەر بەو شێوەیەی کە بەرێوبەرایەتی شاری ئەسینا پێش ئەو ماوەیە لە ژێر چنگی پیسیتراتوس دابوو(٩). کاتێك خەڵك بەفێڵ و تەڵەکەبازی ئازادی لە دەست دەدەن، ئەوەندەی لە نەزانی خۆیان زیانیان پێ دەکەوێ، ئەوەندە لە کردەی کاسەلێسان زیانیان پێ ناگات. هاوشێوەی ئەم بارودۆخە بەسەر خەڵکی شاری *سیراکوس*، یەکێك لەشارە گرنگەکانی *سیسیلیا* هات. ئەوان کە سەرقاڵ بوون بەجەنگ و ئەو مەترسیانەی لە هەرلاوە هەڕەشەی لێدەکردن، ئاگایان لەوە نەبوو کە بەهۆی متمانەبەخشین بە *دەنیس* (١٠) و هەڵبژاردنی بۆ فەرماندەی سوپا، دەسەڵات دەبەخشنە یەکەمین دیکتاتۆر کە بەهۆی ئەو دەسەڵاتەوە، دوای تێکشکاندنی دوژمن و گەڕانەوەی سەربەرزانەی، لەرێگەی گۆڕینی خۆی لە فەرماندەی سوپاوە بۆ شا، پاشان لە پاشاوە بۆ زۆردار، لەبنەڕەتدا دەکەوێتە سەرکوتکردنی هاوسەنگەرەکانی خۆی. (١١)

باوەڕناکرێ کاتێك یەك میللەت دەبێتە فەرمانبەر، چەندە زوو ئازادی خۆی بیردەچێتەوە و بەجۆرێك لەیادی دەچێتەوە کە ئیدی هەرگیز رێگە بەخۆی نادا جارێکی دی بیری لێبکاتەوە، ئەوەندەش ئاسان و سادە و بەکەماڵی مەیلەوە ملکەچ دەبێ کە هەر چاودێرێك وا هەست دەکات ئەمانە زێتر لەوەی شتێکیان بەناوی ئازادیەوە لەدەست دابێت، شتێکی دیکەیان بەناوی کۆیلەتیەوە بەدەست هێناوە، راستە بەستنەوەی خەڵك لە سەرەتادا، کارێکی قورس و سنووردارە، بەجۆرێك کە پێویست دەکات زەبروزۆری تیادا پیادە بکرێت، وەلێ نەوەی دواتر بەئاسانی ملکەچ

دەبێت، ئەم ملکەچیە لەسەر شێوەی باب و باپیرانی خۆی وەك شتێکی سروشتی و گومان لێنەکراو تێی دەڕوانێ. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە زۆرینەی ئەو مرۆڤانی لە سایەی کۆتوبەندا لەدایك دەبن و لە سایەی هەمان کۆت و بەندا پەروەردە و گەورە دەبن و خوو بەکۆیلەتیەوە دەگرن، ئەو بارەیان بەتەواوی لەلا ئاسایی و بێ کەموکووڕی دێتە بەرچاو. ئەم خەڵکانە لە مافی خۆیان ئاگادار نین و شێوازێکی دیکەی حکومەتکردن ناناسن و ئەو هەلومەرجانەی کە تێیاندا هاتوونەتە دونیاوە بەتەواوی بەسروشتی دەزانن. هەڵبەت نەوەی داهاتوو بەردەوام خاڵە لاواز و گوشە تاریکەکانی ژیان و پەیوەندییەکانی باب و باپیرانیان مشتومالّ دەکەن و لەنێو کتێب و بەرهەمەکانیاندا دەکەونە لێکۆڵینەوە. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، نفووزی بەهێزی نەریت و خووپێوەگرتن، بە تایبەتی خووگرتن بە گوێڕایەڵیەوە، هیچ کامێکیان دڵنیاکەر و پاساودەر نین. گوتوویانە کە *میهرداد* (میتریداتوس) (١٢) خۆی بە خواردنەوەی ژەهر راهێنابوو تاکو لەبەرامبەریدا بەرگری دروست بکات. ئێمەش وەکو ئەو فێربووین ژەهری کۆیلەتی بنۆشین و خوو بەتاڵیەکەیەوە بگرین. ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین کە سروشت، ئێمە بە پێی خواست و ویستی خۆی پەروەردە دەکات و ناچارمان دەکات کە هێز و لاوازیەکانی خۆمان بەدیارخەین. لەگەڵ ئەمەشدا، پێویستە دان بەوەدا بهێنین کە دەسەڵاتی نەریت و خووپێوەگرتن زۆر زێترە لە دەسەڵاتی سروشت، چونکە خەسڵەتە خۆڕسکەکانی مرۆڤ، خەسڵەتە باشەکانی، یان بەد و ناشرینەکانی، ئەگەر پەروەردە نەکرێن، لەناودەچن. لەکاتێکدا کە ژینگەی دەوروبەر لەسەر شێوەی تایبەتی خۆی شێوەمان پێدەدات، تەنانەت ئەگەر ئەمە پێچەوانەی خووی سروشتی و زگماکیانەی خۆشمان بێت. ئەو تۆوی چاکیانەی کە سروشت خستونیەتە نێو خۆڕسکی ئێمەوە هێندە لاواز و



بێمایەن کە ئەگەر بە دروستی خزمەت نەکرێن، بەرگەی کەمترین زیانیش ناگرن. ئەم تۆوانە بەزەحمەت دێنە بەر، بە ئاسانی دەڕزن و، دواجاریش لەناودەچن. درەختەکانی میوە ئەگەر بەدرێژایی گەشەیان شوکێکیان پێ نەکەوێت توانای میوەگرتنیان دەپارێزن. بەڵام ئەگەر بەشتێك ئاڵوودە بین یاخود لە ژینگەیەکی نەگونجاودا داچێنرێن، بەرەبەرە لەناودەچن.

هەموو گیایەك تایبەتمەندیگەلێکی تایبەت بە خۆی هەیە. بەم پێیە، سەرما، ئاووهەوا، خاك، یاخود تەنانەت دەستەکانی باغەوانیش دەشێ لەتوانایی ئەو گیایە و کەم و زێدەکردنیدا کاریگەری هەبێت. رووەکەکان هەریەکێکیان خەسڵەتگەلێکی تایبەت بەخۆی هەیە و ئەو تایبەتمەندیانەی لە رووەکێکدا دەبینین، لە یەکێکی دیکەدا نابینین. چ کەسێك یەکەمین دانیشتووانی *ڤینیزیای* لەبیرە؟ یاخود ئەوانی لەنزیکەوە بینیون؟ ئەو پیاوە ئازادانەی کە شەڕانیترینیان بەبەراورد لەگەڵ زۆردارێکی ئەمڕۆدا فریشتە بوو. ئەو مرۆڤانەی کە ئەگەر دەکەوتنە رکاربەری لەگەڵ یەکتر تەنها لەسەر باشترکردنی ئاستی ژیان و دەوڵەمەندکردنی ئازادی بوو. ئەو میللەتەی ئامادە نەبوو هێندەی سەرە دەرزیەك ئازادیەکەی بە هەموو چێژ و خۆشیەکانی جیهان بگۆڕێتەوە. من ئەمڕۆ دەپرسم کێیە ئاگاداری رابردووی ئەم میللەتە بێت و بتوانێت *ڤینیزیای* ئەمڕۆ کە لەژێر کۆت و بەندی دۆجی گەورە (١٣) دایە، ببینێت و سەرسام نەبێت بە بینینی میللەتێك کە ئامادە نییە هێندەی سەرە دەرزیەك دیلەتی و بەندایەتی و گیانی خۆی بەئازادی بگۆڕێتەوە؟ چ کەسێك باوەڕ دەکات کە ئەم میللەتە درێژەپێدراوی هەمان میللەتە؟ ئایا مرۆڤ دوای جێهێشتنی ئەم شارە (مەبەست شاری *ڤینیزیایە*. و.ف) بەو ئەنجامە ناگات کە چووتە ناو باخچەی ئاژەڵانەوە؟ لە مێژوودا هاتووە لیکۆرگۆس (١٤)، یاسادانەری سپارتا، دوو تولەسەگ، کە هەردووکیان لە دایکێك کەوتبوونەوە،

یەکێکیانی لە ناندێندا بەدەنگی شەیپوور و ئەوی تریانی لە کێڵگەدا بەدەنگی کەرەنا ڕاهێنا بوو و گەورەکرد و خۆراکی دەدایێ تاکو پیشانی خەڵکی «*لازدیمۆن*»[1]ی بدات کە مرۆڤەکانیش بەو جۆرەی رادەهێنرێن، پەروەردە دەبن. ناوبراو هەردوو سەگەکەی هێنانە بازاڕ و لەبەردەمیاندا لەگەنێك سۆپ و کەروێشکێکی کێوی دانان. یەکێك لەسەگەکان بەرەو لەگەنە سۆپەکە و ئەویتریان بەرەولای کەروێشکەکە رای کرد؛ هەرچەندە وەك خۆی دەیگوت هەردووکیان لە دایکێك کەوتبوونەوە. ئەم پیاوە مەزنە بە دانانی یاسا و رێورەسم، بەجۆرێك خەڵکی سپارتای پەروەردە و رێکخستبوون کە لە دیدی ئەواندا هیچ حکومەتێك باشتر نەبێت لە حکومەتی یاسا و ئەقڵ.

خراپ نییە یەکێك لە وتووێژە سەرنجراکێشەکان لە نێوان نێراوێکی *خەشایارشا*، پاشای مەزنی ئێران و دووکەس لە خەڵکی شاری *لازدیمۆنی* سپارتا بەیاد بهێنینەوە. کاتێك *خەشایارشا* سەربازەکانی خۆی بۆ داگیرکردنی یۆنان ئامادەکردن، چەند نێراوێکی ناردنە شارەکانی یۆنان تا داوای ئاووعەردیان لێ بکەن. ئەمە رووڵێنانی ئێرانیەکان بوو تا داوا لە شارەکان بکەن بۆ خۆبەدەستەوەدان. وەلێ ئەو هیچ پەیکێکی بۆ دوو شاری ئەسینا و سپارتا نەنارد، چونکە هەندێ لەو نێردراوانەی پێشتر داریووشی باوکی، بۆ ئەو دوو شارەی ناردبوون، کوڕانی شار فڕێیان دابوونە کەندڕ و جۆگاکانەوە؛ ئەمەش بەو مانایەی تا تێیان بگەیێنن خۆتان (ئەگەر توانیتان) ئازادانە ئاو و خاك ببەن و بگەڕێنەوە لای پاشای

---

[1] Lacedaem one شارێك بوو لە یۆنانی کۆندا کەوتبووە قەراغ ئورۆتای ناوەندی لاکۆنیە یاخود کۆماری سپارتا. «دووری» یەکان ئەم شارەیان دروست کرد و بەهۆی یاساکانی «لیکۆرگ» (لیکۆرگۆس) بەرێوەیان دەچوو.



خۆتان. پیاوانی یۆنانی رێگایان نەدەدا بچووکترین دەست درێژی و پێشێلکاری بکرێتە سەر ئازادییەکەیان. وێڕای ئەوەش، خەڵکی سپارتا وایان هەست دەکرد ئەم کارە، رقی خواوەندەکانی، بەتایبەتیش *تالتیبیۆس*[2] خواوەندی نێرراوەکانی هەستاندووە. ئەوان لەپێناوی کپکردنەوەی رقی خواوەندەکان و قەرەبووکردنەوەی کارەکەیان، دوو هاووڵاتی خۆیان ناردندە *لای خەشایارشا*. ئەم دوو کەسە *سپێرتا* (Sperta) و *بولیس* (Bulis)، لەسەر ویستی خۆیان ئامادەییان دەربڕیبوو لەبەرامبەر ئەو دوو نێراوەدا، سەربڕدرێن. کەوتنە رێ و لەسەر رێگا گەیشتنە کوشکی ئێرانیەك بەناوی *ڤەیدەرنا* (Hydarnes)، ناوبراو جێگری پاشا بوو لە شارە کەنارییەکانی ئاسیا. ئەم پیاوە بەگەرمی پێشوازی لێکردن و بە خێری هێنان، پاشان لەمیانەی وتووێژدا، پرسی، کە بۆچی نایانەوێ بەخشندەیی و دوستایەتی پاشای ئێران بەدەست بێنن. ڤەیدەرنا پێی گوتن: «ئەی سپارتاییەکان! بزانن کە پاشا رێزی پیاوە مەزنەکان دەگرێت و بڕواتان بێت ئەگەر ئێوەش لە ریزی پیاوەکانی ئەو دەبوون، رێزی لە ئێوەش دەنا؛ ئەگەر ئێوە ئەندامی سوپاکەی دەبوون و ئەو دەیناسین، پێی دەگوتن کە شایەنی ئەوەن ببنە فەرمانڕەوای هەندێك لە شارەکانی یۆنان» پیاوە سپارتاییەکان لە وەڵامدا گوتیان: «*ڤەیدەرنا!* قسەکانی تۆ

---

[2] Talthybius(بەمانای پەیك و جاڕدەر)، لە شەڕی تەروادادا یارمەتی ئاگامەمنوونی دا. بەپێی گێڕانەوەکانی ئەلیادە تالتیبیۆس چەند رۆڵێکی جیاوازی بینین: ئەو ببووە بەرپرسی گێڕانەوەی پرێس لە ئانتلەوە و لە ماکاتونیش کرایە بالوێز. هەروەها واباوە کە بۆ قوربانی کردنی ئەڤگینیا چوو بۆ ئولیس و لەناو ئەو نوێنەرانەدا بوو کە چوونە خزمەت کینبراس لە سپارتا. هولێك (فەیلەسووفێکی رەواقی) هەبوو بەناوی تالتیبیۆس کە خەڵکی بە پارێزەری مافی نێونەتەوەیی و ئازادی هامۆشوی بالوێزەکانیان دەزانی.

سەبارەت بەبارودۆخی ئێمە ئامۆژگارییەکی گونجاو نین، لەبەرئەوەی باس لەو ئیمتیازە دەکەی کە ئەزموونت کردووە، ئاگاداری ئەو بەهرەیە نیت کە ئێمە هەمانە. تۆ فەخری لوتفی پاشات پێ براوە، بەڵام سەبارەت بەئازادی هیچ نازانی و ناشزانی کە ئازادی چەندە پڕشەوق و شیرینە. چونکە ئەگەر ئازادیت ناسیبا، بۆ خۆتان داواتان لە ئێمە دەکرد کە بەرگری لێ بکەین، ئەویش نەك بە قەڵغان و نێزەی دووسەر، بەڵکو بەچنگ و ددان»

تەنێ سپارتاییەکان دەیانتوانی بەو جۆرە وەڵام بدەنەوە و بێ دوودڵی هەردووکیان بەو جۆرەی کە پەروەردە کرابوون قسەیان کرد. شتێکی نامومکین بوو ئێرانییەکان لە حەسرەتی ئازادی دا بن، چونکە نەیاندەناسی؛ مەحاڵ بوو سپارتاییەکانیش لەدوای چەشتنی تامی ئازادی، بەندایەتی و کۆت و پێوەند قەبووڵ بکەن.

*کاتۆ*[15]*ی* قەرتاجنی ئەو دەمەی لە منداڵێك زێتر نەبوو مۆڵەتی ئەوەی پێدرابوو هاتووچوی ماڵی *سیلا*[16]*ی* ستەمکار بکات. لەبەرئەوەی ئەو ئەرستۆکرات بوو هەروەها بەیەکێك لە خزمە نزیکەکانی سیلا حیساب دەکرا، و دەرگای ماڵی سیلا هەردەم بەروویدا کراوەبوو. ئەو بەردەوام

[15] Cato، مارکۆس پرسیۆس (ناسراو بە کاتۆی قەرتاجنی Utican) (٩٥ـــ ٤٦پ ز)، نەوەی کاتۆی مەزن، واتە فەیلەسووفی ڕەواقیی ڕۆم، کە بەپێچەوانەی قەیسەر لە ئەنجومەنی پیراندا بەرگری لە ئازادی دەکرد. لەدوای تێکشکانی تاپسوس لەساڵی ٦٤دا خۆی بە شمشێرەکەی خۆی کوشت. کاتۆی لاو لایەنگری کۆماری و ئازادی بوو، لە سیاسەتیشدا پارێزگاریخواز بوو. هەر لەبەر ئەوەش لەدژی ژۆلیۆس قەیسەر وەستایەوە و بەرگری لە پێمپیۆس کرد.

[16] Sylla، لۆکیۆس کۆڕنلیۆس ناسراو بە سیلا ستەمکاری ڕۆمیی دێرین (١٣٦ــ٧٩پ ز)، لە سەرەتاوە ئەو جێگری ماریۆس بوو، بەڵام دواتر چووە ڕیزی ناحەزەکانیەوە. سیلا پیاوێکی بوێر و فێڵباز بوو بۆیەشە ناویان نابوو شێرـ ڕێوی. ساڵی ٨٨پ ز بووە ئەندام لە ئەنجومەنی پیراندا و داگیرکردنی ئاسیای پێسپێردرا و چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێنان.



مامۆستای ماڵەوەشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. ئەو لەو ماڵەدا چەندین جار بینیبووی بەفەرمانی ئەو دیکتاتورە، کەسانێك دەخرێنە زیندانەوە یان حوکمی مەرگیان بەسەردا دەدرێت؛ یەکێك دوور دەخرێتەوە و یەکێکی دی بێدەنگ دەکرێ. کەسانێکی دەدی ماڵ و سامانی خەڵکیان دەدزی و کەسانێکی دیکەش قەسدی سەری خەڵکیان دەکرد؛ بەکورتی هەرکەسێك دەهاتە ئەو ماڵەوە نەك وەك ئەوەی هاتبێتە ماڵی قازی شارەوە، بەڵکو وەك یەکێك لەژێردەستەکانی زۆردار دەهاتە خزمەتی، ئەمە دادگایەك نەبوو لەپێناو پاراستنی دادپەروەری بەڵکو بنکەیەکی ستەمکاری بوو. کوڕێژگەی لاو بەدیتنی ئەم دیمەنانە لە مامۆستاکەی پرسی: «بۆچی خەنجەرێکم نادەیتێ؟ لەژێر عەباکەمی دەشارمەوە. زۆربەی ئەوکاتانەی سیلا خەوی لێکەوتووە من دەچمە ژوورەکەیەوە و دەستەکانیشم هێندە بەهێزن کە بتوانم شارێك لە شەڕانیەتی ئەو ڕزگاربکەم.» لەڕاستیدا ئەم گوتانە لە پیاوێکی وەکو کاتۆ دەوەشێن؛ لە ڕاستیشدا ئەمە خاڵی سەرەتای دروستبوونی پاڵەوانێکە کە بە قەدەرێکی ستایشکراو کۆتایی هات. هەموو کەسێك دەتوانێ زەن بکات ئەم پیاوە کوڕی ئەو ڕۆمیەیە کە بەئازادی دەژیا.

باشە من بۆ ئەم قسانەم پێ گوتن؟ بەدڵنیایەوە لەبەرئەوە نە کە ئازادی یان ئازادیخوازی بدەمەپاڵ وڵاتێك یان هەرێمێك، لەبەرئەوەش نە کە دیلەتی لە هەموو شوێنێك و لە هەموو کاتێکدا ناخۆشە و ئازادیش لە هەموو شوێنێك خوازراو و شیرین؛ بەڵکو بەو هۆیەوە کردمن کە پێویستە داخ بۆ گوزەرانی کەسانێك بخوین کە لەژێر سایەی کۆت و بەندا لەدایك دەبن. ئەوان گوناهێکیان نیە، چونکە تەنانەت سێبەرێکی ئازادیشیان نەدیوە و لەبەرئەوەی هیچ نایناسن، ناتوانن درێوی کۆیلەتیش دەستنیشان بکەن. ئەگەر وڵاتی سیمیریەکان (Cimmerians) کە هۆمەر

له بەرهەمەکانیدا باسی کردووە (١٥) لەواقیعدا هەبووایە، ئەو ولاتەی نیوەی ساڵ لە رووناکایی و نیوەکەی دیکەیشی لە تاریکایی رەهادا بەسەر دەبرد، ئایا دەبوو سەرمان بسوڕمێ ئەگەر بماندیبا خەڵکی لە درێژەی شەش مانگ تاریکیەکەدا بەجۆرێك خوویان بەتاریکیەوە دەگرت کە ئیدی رووناکیان بیر دەچووەوە تا ئەوکاتەش کە یەکێك باسی لەخۆر و درەوشانەوەی نەکردبا بە بیریان نەدەهاتەوە و تەنانەت مەیلی دیتینیشیان نەبوو. مرۆڤ هەرگیز حەسرەت بۆ ئەو شتە ناخوات کە نەیبووە؛ ئارەزووەکان تەنیا ئەوکاتە دروست دەبن کە پێشتر ئەزموون کرابن و، ئەوە لەمیانەی رەنج و غەمدایە کە یادەوەری چێژەکانی رابردوو سەرهەڵدەدا. بەئازادی ژیان و مەیل بۆ ئازادی بەشێکە لە چارەنووسی مرۆڤ، بەڵام کەسایەتی ئەو بەجۆرێکە کە بە شێوەیەکی رەمەکی بەو ئاراستەیەدا دەڕوا کە لە ئەنجامی وەرگرتن، تیایدا سەرهەڵدەدا.

کەواتە پێویستە دان بەوەدا بنێین کە هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ فێریان بووە بەلای ئەوەوە تەواو سروشتین و تەنیا ئەو هەستە سەرەتایی و خاوەیە کە لە تاکایەتی ئەودا دەمێنێتەوە. بۆیە، خوو، یەکەمین هۆی خۆبەکۆیلەکردنی مرۆڤە. مرۆڤەکان لەو ئەسپانەی پێشبرکێ دەچن کە لە سەرەتاوە دەستەمۆ ناکرێن، بەڵام خوو بە ئاوسار و زین و لغاوەوە دەگرن و خۆیان بەدەست ئاوزەنگی و کۆتەوە دەدەن. مرۆڤەکان بەو بڕوایەوە گەورە دەبن کە هەردەم بەو جۆرە بووە هەندێك فەرمانبەر بن و باب و باپیرانیشیان لە ملکەچییەکی پەتیدا دەژیان. ئەوان وابیردەکەنەوە کە جگە لەمە چارەیەکی دیکەیان نییە و بەهێنانەوەی نموونە و شایەتی بێ شومار، خۆیان ناچار بەپەسەندکردنی گوێڕایەڵی دەکەن و باوەڕ بە خۆیان دەهێنن، هەروەها تا ئەو شوێنەش دەچنە پێشەوە کە بە پێی ئەو بڕوا



ریشەدارەوە، تەنانەت بەمافی فەرمانڕەوایی و موڵکایەتی کردنی چارەنووسی ژێردەستەکانیش بۆ فەرمانڕەواکان قایل دەبن.

هەمیشە چەند کەسێك هەن کە زاناترن لە ئەوانی دیکە و هەست بە قورسی کۆت و بەند دەکەن. ئەم کەسانە قەتاوقەت دیلەتی قەبووڵ ناکەن و بەردەوام لەململانێدان لەگەڵیدا: ئەوان کەسانێکن هیچ کاتێك نەدەستەمۆ دەکرێن و نەخۆیان بەدەستەوە دەدەن و هەمیشە وەك *یۆلیس*، لە وشکانی و دەریادا، بەدوای ئەسلی خۆیاندا دەگەڕێن؛ مافە لەدەستچو و سروشتیەکەیان دەناسن و ئەو رێگایەشیان لە یادە کە پێشینانیان لەسەری رۆیشتوون. ئەوان کەسانێکی رووناکبین و دووربینن وەك ئاپۆرەکانی خەڵك تەنیا سەری لوتیان نابینن، بەڵکو سەیری دواوە و پێشەوەیان دەکەن؛ بەنیۆ رابردوودا سەفەر دەکەن تاکو بەبیرهێنانەوەی بەها کۆنەکان، لەبارەی داهاتووەوە دادوەری بکەن؛ و هەردوو ماوەکە لەگەڵ هەلومەرجە هەنوکەییەکان بەراورددەکەن. ئەوان خاوەن بیروهزری تەندروستن کە بەخوێندنەوە و بەدەستهێنانی مەعریفە گەشەیان پێدەدەن و زاخاوی دەدەنەوە. تەنانەت ئەگەر ئازادی لە لاپەڕەی رۆژگار بسڕێتەوە و بەتەواوی فەراموش بکرێت، ئەم مرۆڤانە دووبارە دەیخوڵقێننەوە. بەبۆچوونی ئەوان، دیلی و کۆیلەتی، لەهەر بەرگێکدا دەرکەون، ناشایستە و نەخوازراون.

تورکی گەورە(١٦) بەباشی دەیزانی کتێب و خوێندنەوە و فێربوون، زیاد لە هەر شتێکی دیکە مرۆڤ بەرەو سروشتی خۆی ئاراستە و لە ستەمکاری بێزاری دەکەن. لە سەردەمی ئەودا، ئەو خەڵکەی خوێندبوویان زۆر کەم بوون، چونکە ئەو لە خەڵکی خوێندەوار دەترسا و حەزی نەدەکرد ژێردەستەکانی بخوێنن. لەمبارەیەوە پێویستە بڵێین، پیاوە بەغیرەت و دڵسۆزەکان کە بە تێپەڕینی کات، خۆشویستنی ئازادیان

لەخۆدا پاراستووە، هێشتا بێ دەسەڵات و بێ کاریگەرن، چونکە هەرچەندەش ژمارەیان زۆر بێت، لەیەکتر دوورکەوتوونەتەوە و یەکتر ناناسن. لە حکومەتێکی ستەمکاردا، ئەوان لە ئازادی کار، دەربڕین، تەنانەت ئازادیی بیرکردنەوەش بێبەشن و بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆیان بەتەنیا ماونەتەوە، لە راستیدا *مۆمۆس*[١٧]، خوای گاڵتەجاڕی و کینایە، کاتێك بەو مرۆڤەی ڤۆلکانی[١٨] ئەفراندبوو پێدەکەنی و رەخنەی لێ دەگرت، بەوەی ئەو خوایە لە دڵی دروستکراوەکەیدا کلاورۆژنەیەکی نەکردۆتەوە تا لەو رێگایەوە، هەست بە هزر و هەستەکانی بکات، تەنیا گاڵتەجاڕی نەدەکرد. گوتویانە *بروتوس*[١٩]،

---

[17] Momos، بەرجەستەکەری ((کینایە و گاڵتەکاری)) لە کتێبی تیۆگونیدا کیژی شەڕ بووە. لەو دەمەدا کە زەوی بەهۆی زێدەبوونی لەپڕی ژمارەی دانیشتووانەوە هەستی بە قورسایی خۆی کرد داوای لە زیۆس کرد تا قڕیان تێبخات. زیۆس مرۆڤایەتی دووچاری شەڕێك کرد و بەم شەڕەش دەگوترێت شەڕی " تا".

[18] Volcanus (Vulcanus) ڤۆلکانوس یەکێکە لە خواوەندە رۆمیەکان، خاوەنی قەشەیەکی تایبەت بووە و جەژنی ئەو بەناوی ڤۆلکانالیا لە ٢٣ ئابدا بەرێوەدەچێ. لە جەژنی ئەم خواوەندەدا واباوە ماسی و ئاژەڵەکانی دی فڕێدەدرێنە ئاگرەوە وەك گیانی مرۆڤ تەماشایان دەکردن کە لەپێناوی خواکاندا بکرێنە قوربانی و بەمجۆرەش خواکان گیانی قوربانی بەخشەکان بپارێزن.

[19] Brutus، مارکۆس یۆنیۆس، وەچەی بروتوسی یەکەم ( لە دەوروبەری ٨٥ ـ٤٢پ ز) ئەو بە هاوەڵایەتی کاسیۆس لە پلانی دژ بە قەیسەری رۆمدا، کە زڕباوکی خۆی بوو، بەشداری کرد. کاتێك قەیسەر لەنێو بکوژەکانی خۆیدا ئەوی بینی، دەستی لە بەرگریکردن هەڵگرت و هاواری کرد: ((تۆش، کوڕەکەم!)) بروتوس و کاسیۆس دواتر لەلایەن ئانتۆنیۆس و ئوکتایۆسەوە رەدوونران و تێکشکێنران. ئەودەم بروتوس وەك پلۆتارك دەیگێڕێتەوە، ئەم رستەیەی بەزاردا هات: ((ئەی پەرستن، تۆ لە وشەیەك زێترنی!)) پاشانیش خۆی دا بەسەر نوکی شمشێرێکدا.



*کاسیۆس*[٢٠] و *کاسکا* کە پەیمانیان دابوو رۆما ئازاد بکەن و لە دوایشدا هەموو دونیا رزگار بکەن، *سیسەرۆن*[٢١] (تاکە پارێزەری گەورەی بەختەوەریی خەڵکی لەو کاتەد) لە گروپی خۆیاندا پەسەند نەکرد؛ چونکە ئەویان ترسنۆکتر لەوە دەزانی کە جورئەتی ئەو بزاڤەی هەبێت. ئەوان متمانەیان بە باوەڕ و ویستی ئەو هەبوو بەڵام هێندە لە بوێری ئەو دڵنیا نەبوون. بەم پێیە، هەر کەسێك کە لە رەوش و حاڵی رۆژگارە کۆنەکان دەکۆڵێتەوە و سەرگوزشتەی چاخی کۆن هەڵدەداتەوە، پاڵەوانێك نادۆزێتەوە کاتێك بە مەبەستێکی رەگداکوتاوو بڕوای پتەوەوە دەچێتە شەڕ، نەتوانێت وڵاتی خۆی لەژێر کۆتی دیلەتی خراپەکاران رزگاربکات. وەك ئەوەی ئازادی، بۆ پیشاندانی جەوهەری خۆی پێیان، هێزێکی نوێیان پێ دەبەخشێت. *هارمۆدیۆس*[٢٢] و

---

[20] کاسیۆس، لنگینۆس، لە بنەماڵەیەکی نەجیبزادە و رەسەن بوو، لە سەفەرە جەنگیەکەی کراسوسدا لەدژی فەرسیەکان پێگەی راوێژکاری لەئەستۆ گرت. لە کاتی شەڕی ناوخۆدا کەوتە لایەنگیریکردن لە پۆمپیۆس و پارتی لایەنگیری ئەنجومەنی پیران، لە پلانی کوشتنی قەیسەریشدا کاریگەرییەکی دەستنیشانکەری هەبوو و توانیشی بروتوس تێکەڵ بەو رووداوە بکاتم.

[21] Cicero ، مارکۆس تولیۆس وتاربێژ و سیاسەتوانی رۆمی (١٠٦ ـ٤٣پ ز)، لە سەرەتای لاوێتیدا شیعری دەنووسی و خۆی سەرقاڵ کردبوو بە وەرگێڕانی ئەدەبی یونانیەوە. لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا بەشداری شەڕی کرد. لە ساڵی ٦٣پ ز هاتە گۆڕەپانی سیاسەتەوە و وتارگەلێکی بێ هاوتای لە ستایش و هەجوی پیاوان و کەسایەتیەکاندا نووسی. لەبەر ئەوەی قەیسەر نەیتوانی بیکاتە پاشکۆی خۆی کەوتە دوژمنایەتیکردنی و دووری خستەوە. ساڵی ٤٣ز بەخولیای سیاسەتەوە سەری نایەوە.

[22] Harmodios (٥١٤پ ز)، هارمۆدیۆس بەهاوکاری ئاریستوگیتۆن کە دوو لاوی بوێری ئەسینایی بوون، ستەمکاری ئەسینا ((هیپارخۆس)) یان کوشت. هارمۆدیۆس دەمودەست لەلایەن

*ئارسیتۆژیتۆن*[٢٣]، *تراسیبۆلوس*[٢٤]، *بروتوسی* باوك، *ڤالریانۆس و دیۆن*[٢٥]، هەموویان ئەو پاڵەوانانەن کە سەرفیرازانە لە ڕێگای ئامانجێکدا خەباتیان کردوو سەرکەوتوون، چونکە ویستی بەهێز هەمیشە بەختی باش دێنێتەبەر. بروتوسی کوڕ و کاسیۆس توانیان دیلی و کۆیلایەتی نەهێڵن هەرچەند لە ڕێی ئازادیدا گیانیان بەخشی، بەڵام مردنیان زۆر شەرافەتمەندانە و بەشکۆ بوو (بێ ڕێزیەکی گەورەیە ئەگەر بگوترێت ئەم پیاوە ئازایانە، چ لەمەرگ و چ لە ژیاندا، مرۆڤی کەموکورت بوون).(١٧)

لەدەستچوونی ئەم پیاوە مەزنانە، زیانێکە قەرەبوو ناکرێتەوە و بەدبەختیەکی هەمیشەیی بوو کە سەرەنجام، بەرەو دارمانی تەواوی کۆمارەکە چوو و کۆماری و ئازادی هاوشان بە مەرگیان ژێر خاك کران. شەڕەکانی دواتر، هەموویان، تەنیا چەند پیلانێك بوون لەلایەن پیاوگەلێکی پلەوپایەخوازەوە کە تەنانەت شایانی ناو هێنانیش نین، چونکە بێگومان ئەوان بە دوای لەناوبردن و سەرنگونکردنی ئیمپراتۆرەوە نەبوون بەڵکو لە حەسرەتی تاج و تەختدا دەسووتان. ئەوان بە پیلانگێڕان

پاسەوانەکانی هیپارخۆسەوە کوژرایەوە، بەڵام ئاریستۆگیتۆن دەست بەسەرکراو لەدوای سزادان بەکوشت چوو، خەڵکی ئەسینا وەك دوو پالەوانی گیانبەخش یادیان کردنەوە.

[23] Aristogiton، ئاریستۆگیتۆن (بڕوانە پەڕاوێزی پێشوو).

[24] Thrasybulus، ساڵی ٣٨٨پ ز کۆچی دوایی کردوە و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ((سی ستەمکار))ەکەدا ناچار بە دوورکەوتنەوە کرا. لەپاش شەڕەکانی پلۆپێنیز لە شاری تیب (Thebes) سوپایەکی لە دوورخراوەکان پێکەوەنا و ساڵی ٤٠٣ دەوڵەتی ستەمکارەکانی رووخاند.

[25] Dion (٤٠٩ـ٣٥٤پ ز)، ڕێبەری سیاسی یۆنان لە شاری سیراکۆس، کوڕی دیۆنیسیۆسی یەکەم، یەکێك بوو لە قوتابیانی ئەفلاتوون و رکابەرە سەرسەختەکانی ستەمکاری. ساڵی ٣٥٧پ ز سوپایەکی لە ئەسینا کۆکردەوە و دیۆنیسیۆسی بچووکی لەناوبرد و حوکمڕانی شاری سیراکۆسی گرتەدەست و دواجار بەدەستی رکابەرەکانی تیرۆرکرا.



لەدژی ئیمپراتۆری ستەمکار، مەبەستیان بوو بیهێننە خوارەوە و خۆیان بچنە سەرتەختی ستەمکاری. بەبۆچوونی من، ئەم جۆرە پیاوانە هەرگیز شایستەی ئافەرین نین و خوشحاڵم لەوەی ئەم جۆرە پیاوانە دەریانخست بەکاری خۆیان کە ناکرێ ناوی پیرۆزی ئازادی وەك پەردەیەك بۆ داپۆشینی هەر کارێکی سپلە بەکار بهێنرێت.

دەگەڕێمەوە سەر درێژەی قسەکانم: هۆی سەرەکی ئەوەی مرۆڤەکان بەخواستی خۆیان گوێڕایەڵی لە فەرمان و بڕیارەکان دەکەن ئەوەیە کە بە کۆیلەیی لەدایکدەبن، کۆیلەش دەهێننە دونیاوە. لەم هۆیەوە، ئەنجامێکیش سەرهەڵدەدات: خەڵکی لەژێر کۆنترۆڵی ستەمکاران بەسادەیی دەبنە کەسی ترسنۆك و باڵادەستی قەبووڵ دەکەن. بۆ ئەم بەڵگەهێنانەوەیە قەرزاری بۆقرات[٢٦]، حەکیمی گەورەی یۆنانین، کە لە گوتارێکدا لەبارەی نەخۆشیەکان سەرنجی دایە ئەم خاڵە. *بۆقرات* داوەتی پاشای گەورە (*ئەردەشێر هەخامەنشی*) بۆ چوون بۆ دەربارەکەی ڕەتکردەوە، چونکە تێگەیشت پاشای ئێران هەوڵدەدات بەچاوبرسی کردن و بەخشینی ئیمتیازی تایبەتی، بیکڕێت. *بۆقرات* تەواو راشکاوانە وەڵامی دایەوە کە ئەگەر زانستی خۆی لە ڕێگای چارەسەرکردنی ئەو دڕندانەی، مەبەستیانە هاونیشتمانیەکانی لەناوبەرن، یاخود هەرکەسێکی دیکە کە دەیەوێت یۆنان بۆ ناو دیلەتی و کۆیلایەتیەکی زێتر پەلکێش بکات، بخاتەکار ویژدانی خۆی دووچاری ئازارێکی قورس دەکات. ئەو نامەیەی ئەو لە وەڵامدا بۆ پاشای ئێران نووسیویەتی، هێشتا لەنێو بەرهەمەکانی

[26] Hippocrates (٤٦٠ـ٣٧٥پ ز)، گەورەترین پزیشکی جیهانی دێرینە. لەماوەی ژیانیدا ناوبانگێکی جیهانی هەبوو. ئەردەشێری هەخامەنشی بۆ پزیشکایەتی داوەتی دەرباری کرد، بەڵام پەسەندی نەکرد.

ئـەودا تۆمـارکراوە و بەڵگەیەکـە لەسـەر گـەورەیی دڵەکـەی و کەسـایەتی بەرزی بۆقرات.

کەواتــە تێدەگــەین کاتێــك ئــازادی نامێنێــت، ئازایــەتی و بــوێریش لەناودەچـن. نەتەوەیـەکی فەرمانبـەر، لـە جەنگـدا، هـیچ ئـارەزوو، یـان پەرۆشـی و شـەوقێك لـە خـۆی پیشـان نـادات: لـە کـاتی رووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ مەترسـیدا پاشەکشـێ دەکـات و هەڵـدێت و خۆشەویسـتی ئـازادی لـەدڵی ئەوانـدا هـیچ پریشـکێ داناگیرسـێنێت تـاکو بـەرەو پـێش بچـن و بەمــەرگێکی دلێرانــە و شــانازیئامێزەوە، خۆیــان بــۆ زرگــارکردنی هاوکاروانـەکانیان بکەنـە قوربـانی. بـەڵام پیـاوانی ئـازاد بـۆ بەختـەوەری هاوچەشــنەکانیان ململانــێ دەکــەن و هەریەکــەیان پــێش ئــەوی دیکــە دەکـەوێت و ئەگـەر تێـك بشـکێن، هـەموویان خۆیـان بەبەشـدار دەزانـن، بەهـەمان شـێوەی لـەکاتی سـەرکەوتندا، هـەموویان شـەریکن. بـەڵام ئـەو کەسانەی خۆیان بەدەست ملکەچی و کۆیلایەتیەوە داوە، جگـە لـە نـەبوونی بوێری و روحیەتی خەبات، هـیچ نیشـانەیەکی هێـز و حـەزی شۆڕشـگێڕیان تێدا نییە، چونکە دڵی ئـەوان راپـێچ کراوەتـە نـاو زەلیلـی و چـەپەڵییەوە، دەسەڵات بەسەریاندا زاڵ بووە و توانای ئەنجامدانی کاری گەورەیان نییە. زۆرداران زۆربــاش ئاگــادارن لــەو خاڵــە و بــۆ ئــەوەی ژێردەســتەکانیان هەرچەند زێتر ناچاری چەوتی و زەلیلـی و خۆبەدەسـتەوەدان بکـەن، ئـەم روحیەتەیان تێدا بەهێز دەکەن و هەوڵدەدەن بیکەنە شتێکی رەمەکی .

*گەزنەفۆن*، مێژوونووسی گەورەی یۆنانی، لە یەکێك لە کتێبەکانیدا، لـە وتووێژێکدا لەنێوان *هیرۆن*[٢٧]، زۆرداری *سیراکۆس* و *سیمۆنیدس*[٢٨] باسی لـە

[27] Hieron (٤٧٨ـ٤٦٦پ ز)، فەرمانڕەوای ستەمکاری سیراکۆس، خەڵکی یەکێك لە شارەکانی سەقلیایە. لەماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا، دەسەڵاتی قەرتاجیەکانی لە سەقلیا



هەڵچـوون و نیگەرانیـەکانی ئـەم زۆرداره کـردووه. ئـەم کتێبـە پـڕه لـەو رەخنانـەی کـە لـە چوارچـێوەی گوتـە و پەیڤـەکانی ئـەو زۆردارەدا بـەیان کـراون. بریـا هـەموو زۆردارانـی سـەر رووی زەوی ئـەم کتێبـەیان وەك ئاوێنەیەك لەبەرامبەر چاویان دادەنا ! پێموایە ئەوان بتـوانن خۆیـان ببینـن و لە لەکەی نەنگی خۆیان هەستی شـەرم دایانگرێت. لـەم نامەیـەدا، ئـەو رەنـج و ئەشـکەنجەیەی یەخـەی زۆرداران دەگوشـێت بەباشـی راڤـەکراوە، چـونکە ئـەوان سـتەمیان لـە هـەموان دەکـرد و لـە سـێبەری خۆشـیان دەترسان. لە خاڵە سەرنجراکێشەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە کـە دەنووسـێت: پاشاکان لە کاتی لەشکرکێشی یاخود شـەڕ و هێـرش کردنـە سـەر دوژمـن، چـەکەکان بەسـوپایەك لـە کرێگرتـەی دەرەکـی دەدەن؛ چـونکە دەترسـن چەك بەپیاوەکانیان ببەخشن. (هەندێك لـە پاشـاکان، تەنانـەت پاشـاکانی فەرەنسای کۆن، کرێگرتە دەرەکیەکانیان بۆ جەنگ دەنـاردن تـاکو گیـانی خــەڵکی وڵاتەکــەی خۆیــان نەکەوێتــە مەترســیەوە و، لــە راســتیدا، لەدەستچوونی پارەیان بەباشـتر دەزانـی لـە لەدەسـتچوونی پیاوەکانیـان. هەروەها *سیپیۆن*[٢٩] بەهەمان مەبەست دەیگوت ئەگەر گیـانی هاووڵاتیـەکی

سەرکوتکرد. وێڕای ئەوەی کەسێکی ستەمکار و زۆردار بوو، بەڵام حەزی زۆری لە ئەدەب و شیعر بوو؛ شاعیرانی وەك ئەسکیلۆس پیندار لە دەرباری ئەودا شیعریان دەخوێندەوە.

[28] Simonides (٥٦٦ـ٤٦٧پ ز)، خەڵکی سیۆس (Ceos)ی یەکێك لە شارەکانی سەقلیایە، تەنزنووس و شاعیری غینایی سەردەمی خۆی بوو. لە سرووده بەناوبانگەکانی ئەو سروودەکانی سەرکەوتنی یاریە ئۆلۆمپیە دێرینەکانە. زۆرترینی تەمەنی خۆی لە ئەسینا بەسەربرد و لە دەرباری ستەمکارانی ئەم شارە خزمەتی دەکرد.

[29] Scipio Africanus (ساڵی ٢٢٥یان ٢٢٧پ ز مردووه)، سەرکردەی بوێر و بەهێزی رۆمی کە لە ئیسپانیا چەند سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێنا و سەرنجی خەڵکی راکێشا و بووە کونسوڵ. لە کاتی هەڵمەتی هانیبال Hannibal پێشنیاری کرد ئەفریقا بکەنە گۆڕەپانی جەنگ.

خۆم رزگار بکەم باشترە لەوەی گیانی سەد کەس لە دوژمنەکانم لەناوببەم.) چونکە بەڕوونی دیارە دیکاتورێك تا ئەو کاتەی لە بێ توانایی و بێ جەربەزەیی ژێردەستەکانی دڵنیانەبێت، پایەی دەسەڵاتەکەی پتەو و جێگیر نابینێت. بەم پێیەش لەوانەیە ئەو سەرزەنشتەی *تەرەزان* لە گەورەی فیلەکان کردی و *تێرنس*[٣٠] دەیگێڕێتەوە، لەبارەی ئەم دیکتاتورەوە بەتەواوی راست بێت.

ئایا تۆ لەو رووەوە بەخۆت دەنازی

کە فەرمانڕەوای چوارپێیەکانی؟

دیارترین نموونەی سیاسەتی بەتاڵکردنەوە و بێ کاریگەرکردنی خەڵکی ژێردەستە دەتوانین لە رووداوێکی مێژوویی وڵاتی لیدییێدا تێبینی بکەین؛ *کۆرۆش* لە دوای ئەوەی کە شاری سەرەکی لیدیێ، ساردیسی ئازادکرد، *کرزۆسی* پاشای دەوڵەمەند و ئەفسانەیی ئەو وڵاتەی بەخشی و نەیکوشت[٣١]، بەڵام هەواڵیان بۆ هێنا کە خەڵکی ساردیس دەستیان بە شۆڕش کردووە. *کۆرۆش* لە توانای دابوو بە ئاسانی هەموو شار سەرکوت بکات، بەڵام نەیدەویست جەنگ و خوێنڕێژی و تاڵان بخاتەگەڕ. پاشان پەنای بردە بەر فێڵێکی نائاسایی بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش. فەرمانی دەرکرد لە شاردا چەندین سۆزانیخانە، مەیخانە، جێگای رابواردنی گشتی و شوێنەکانی یاری دروست بکەن و خەڵکیان ئاگادارکردەوە کە هەموو خەڵکی ئەوێ، دەتوانن بە بەلاش سوود لەو ناوەندانە وەرگرن و خۆیان سەرگەرم کەن. ئەو ئەم فێڵەی هێندە بەکاریگەر بینی کە دوای ئەوە قەتاوقەت پێویستی بە بەکارهێنانی شمشێر و نێزە نەما. خەڵکی شار وەها بە ڕابواردنە درۆزنە و سەرگەرمکەرەکانەوە خەریك بوون کە لاتینیەکان لە ناوی ئەم وڵاتەوە، (lydia) وشەیludi یان بەمانای «رابواردن و یاری و کاتبەسەربردن»، کە ئێمە لە زمانی ئینگلیزیدا پێی دەڵێین pastim as هێنایە ناو زمانی خۆیانەوە.

هەڵبەت هەموو زۆرداران وا بەئاشکرایی کار ناکەن. لە ڕاستیدا، ئەوەی *کۆرۆش* بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجامیدا و بەئەنجامیش گەیشت، ئەوانی تر لە پەناوە ئەنجامی دەدەن. خودی کۆمەڵ و خەڵکی عەوام بە جۆرێکن کە

---

ساڵی ٢٠٤پ ز دوای بەدەست هێنانی رەزامەندی ئەنجومەنی پیران چووە ئەفریقا و شەڕە یەکلاکەرەوەکەی لەگەڵ هانیبال لە نزیك زاما (تونسی ئەمڕۆ) روویدا و بەسەرکەوتنی سیپیۆن کۆتایی هات.

[30] Publius Terentius Terence ، دەڵێن لەساڵی ١٩٥یان ١٨٥ پ ز لەدایك بووە، کۆمیدینووسی رۆمی خەڵکی قەرتاجنە. ترێنس بە سرۆش وەرگرتن لە کۆمیدیا ئەتلاییەکان چەند شانۆنامەیەکی نووسی، ئەمڕۆکە تەنیا شەش لەم شانۆیانە ماونەتەوە: ئاندریا، خەسۆ، خۆئازار، خواجە، فۆرمیۆ و براکان.

[31] لیدیێ یان لیدی، وڵاتێکی کۆن لە ئاسیای بچووك لە کەنار دەریای ئیجەدا. ساردیس یان سارد (Sardis/Sardes) یەکێك بووە لە گرنگترین و دەوڵەمەندترین شارەکانی لیدیێ. دوای ئەوەی ئاستیاژ کە یەکێك بوو لە نزیکەکانی کروزۆس (Croesos)ی پاشای لیدی لەلایەن کورۆشەوە بەدیل گیرا. کروزۆس بڕیاری دا پەلاماری ئێران بدا و ئاستیاژ رزگار بکات. ژمارەی سوپاییەکانی کروزۆس کەم بوون و هەر لەبەر ئەوەش لە بەرامبەر سوپای کورۆشدا تێکشکان و پاشای وڵاتی پارس بەرەو سارد (یەکێك لە گرنگترین شارەکانی لیدیێ) رۆیشت. کروزۆس بەدەستی کورۆش دیل کرا و شاری ساردیش گیرا. کاتێك هاوڵاتیانی سارد ئەو هەواڵەیان بیست شۆڕشیان بەرپاکرد. کورۆش کە بڕیار بوو کروزۆس لەناو بڵێسەی ئاگردا بسوتێنێ ژێوان بووەوە و لە پێناوی کپ کردنەوەی شۆڕشی شاری سارددا داوای ڕێگا چارەی لێ کرد. کروزۆسیش بەو مەبەستەی شارەکە لەدەست دەرنەچێ بیری لە تەکبیرێك کردەوە و بە کورۆشی گوت بەهۆی دروستکردنی شوێنی رابواردن و خۆشگوزەرانی، هەروەها بەهۆی ئاهەنگگێڕان و موسیقاوە خووی تێکۆشەرانەی پیاوانی شار بەزوویی نامێنێ؛ بەجۆرێك کە ئیتر هیچ ترسێکت نامێنێ لە رابوون و شۆڕشەکەیان. بەمجۆرە شۆڕشی خەڵکی سارد دامرکایەوە.

گومان دەکەن لەو کەسانەی کە دڵسۆزی خەڵکن و خوازیاری رزگارکردنیانن و بەچاوی شکەوە لێیان دەڕوانن و بەپێچەوانەشەوە، سەبارەت بەو کەسەی فریویان دەدات، خوشباوەڕ و نەزانن. دڵنیابە لەوەی هیچ پەڕەندە، یاخود ماسییەك نادۆزیەوە زووتر و خێراتر لەم نەزانانە بەداوەوە ببن. ئەمانە بەئاسانی و بەبچووکترین فێڵەوە بەپێی خۆیان بەرەو داو هەنگاو دەنێن و بەشێوەیەك کە باوەڕ ناکرێت خۆیان بەبەهای دەستگەیشتن بە ئامانج و داخوازیە هیچەکان، بەدەستەوەدەدەن کە مرۆڤ لە سەرسوڕماندا پەنجەی خۆی دەگەزێ. یاریەکان، نمایشە سەرگەرمکەرەکان، گاڵتەجاڕیەکان ، گلادیادتۆرەکان، گیانەوەرە سەیر و سەمەڕەکان، میدالیاکان، پەیکەرەکان، تریاکەکان و.. شتی لەم جۆرە، داوێك بوون بۆ بە دیل گرتنی خەڵکی جیهانی کۆن بەکاردەهاتن و لە راستیدا، بەهای ئازادی ئەوان و رمێك بوو لە دەست ستەمکاریدا. دیکتاتورە کۆنەکان بەیارمەتی ئەم جۆرە کار و خافڵاندنانە، ژێردەستە و بەندەکانیان گوێڕایەڵ و ئارام لەژێر کۆت و بەنددا دەهێشتنەوە؛ ئاپۆرەکانی خەڵکیش، نوقمبوو لە کاتبەسەربردنە درۆیین و رابواردنە پۆچەکاندا، لە تەواوی دەبەنگی و ساکاریدا فێردەبوون فەرمانبەر و ملکەچ بن، هەڵبەت نەهێندە ئابڕوومەندانە کە منداڵان بەتەماشاکردنیان بۆ وێنەی ناو کتێبە دەرسیەکانی، فێرە خوێندنەوە دەبن. زۆردارە رۆمیەکان شێوازی جوانتری دیکەشیان داهێنابوون. ئەوان لە گوشە و کەنارەکانی شاردا، خوانی نازونیعمەتیان رادەخست و (بۆ فریودان) خەڵکی عەوام و دەستبڕیان تێردەکرد، ئەو گەڕۆکە موفلیسانەی هەمیشە لە برسیایەتیدا دەژیان و جگە لە خواردن بیریان لە هیچ شتێکی دیکە نەدەکردەوە. زیرەکترین و تێگەیشتووترینیان هەرگیز ئامادە نەبوو واز لە قاپی شورباکەی بهێنێت و بەدوای سەقامیگری و ئازادی موژدەپێدراو لە



کۆماری ئەفلاتووندا بڕوات. زۆرداران بەخشیش و شتگەلێکیشیان بەخەڵکی دەدا، گەنم، شەراب، دراوی زیو.. ئەوکات هەموویان بۆ شەرمانە هاورایان دەکرد: «هەربژی پاشا!». ئاپۆرە نەزانەکان نەیاندەزانی ئەوەی وەك سەدەقە وەریدەگرن، لە راستیدا بەشێکە لە داراییە تاڵانکراوەکانیان و تێنەدەگەیشتن کە ئەگەر پاشا ئەم داراییانەی لەوان نەدزیبا، ئەوا لە کوێی دەهێنان تا لە نێوانیاندا بەش بکات. ئەو پیاوەی ئەمڕۆ دراوێکی زیو وەردەگرێت و لەسەر یەکێك لەم سفرانە سکی پڕدەکات لەجیاتی ئەم رێزلێنانە، ستایشی تیبریۆس و نیرۆنی دەکرد، دەبێت بەیانی دار و نەداری بخاتە قورگی ئەو چاوبرسیانە؛ منداڵەکانی بەهەوا و هەوەسی ئەو بسپێرێت؛ خوێنی خۆی لەژێر پێی توندوتیژیی ئەم پاشا زۆردارەدا بڕێژێت و تەنانەت هێندەی بەردێك یان کۆلکەدارێك، کەمترین ویست یان بەرەنگاربوونەوە لەخۆی پیشان نەدات. خەڵکی عامە هەردەم بەو جۆرە بوون، تەوق لە گەردن و تەماعکار، ئەمەش هێندە لەگەڵ ئەقڵی ساخدا وێکنایەتەوە، بێباکی و دڵرەقیش لەبەرامبەر پوچی، تاوان، دارمان لەگەڵ هەست و سۆزەکانی مرۆڤدا ناگونجێن. ئەمڕۆ کەسێك نادۆزیتەوە بەناوهێنانی نیرۆن، ئەو دێوەزمە ترسناك و تاعونیە، نەلەرزێت. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئەم گیاندارە دڕندە و خوێنمژە لەوپەڕی پیسی و رەزالەتدا مرد، خەڵکی رۆما کە تا ئەو دەمەش ئاهەنگەکان، یاریەکان و سەرگەرمیەکانی نیرۆنیان لەبیرمابوو و تیایدا نغرۆ ببوون بەجۆرێك خەمباربوون کە بەرگی ماتەمیان پۆشی. ئەمە ئەو راڤەیەیە کە *کۆرنیلیۆس تاکیتۆس* یەکێك لە بڕواپێکراوترین مێژوونووسان نووسیویەتی. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو پەرچەکردارەی پێشتری هەمان خەڵك

کە لە مەرگی *یۆلیۆس* قەیسەر[32]دا پیشانیان دابوو، ئەم ڕەفتارەیان شتێکی سەرسوڕهێنەر نەبوو. *یۆلیۆس* قەیسەر ئەو کەسە بوو کە ئازادی و یاساکانی ئەو خەڵکەی بەبای بیرچوونەوەدا. لە کەسایەتی ئەودا، وەك ئەوەی بە دیاردەکەوێت، هیچ خاڵێکی بەرجەستە نەبووە، چونکە ئازادیپەرستیەکەی کە هێندە ستایش و دەستخۆشی لێ کراوە، زیانی زێتر بوو لە توندی و گرژی هەموو ستەمکارانی سەر رووی زەوی. لەبەرئەوەی ئەم سیما بەڕواڵەت چاکەکار و مرۆڤدوستە لە جەوهەری

[32] سزار، یۆلیۆس (ژۆلیۆس) ناسراو بە قەیسەر (۱۰۱پ ز ـ ٤٤پ ز)، ساڵی ٦٥پ ز کاتێك تەمەنی ۳٥ ساڵ بوو بەسەرۆکی باژێرڤانی هەڵبژێردرا و چەند ملیۆنێکی لە کراسۆس (ئیمپراتوری ئەوکات) قەرز کرد، و یاری و ئاهەنگگەلێکی سەرسوڕهێنەری بۆ میللەتەکەی گێڕان. لەدوای ئەمەش وێڕای نارەزایی ئەنجومەنی پیران، پێگەی پۆنتیڤی مەزنی پێ بەخشرا. قەیسەر مەبەستی بوو بە هەر نرخێك بووە دەوڵەت بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و لەپێناوی ئەمەشدا هەنگاوگەلێکی ڕقاوی هەڵنان، وەلێ سیسەرۆن کۆمارەکەی ڕزگارکرد. لە ئەنجامیشدا قەیسەر، کراسۆس و پەمپیۆسی لێکدی نزیککردنەوە و ئەم سێ کەسەش ڕێککەوتن لەسەر دەستگرتن بەسەر حکومەتی کۆماریدا. بەمجۆرەش یەکەمین یەکێتی (یەکێتی سێ پیاو) دروست بوو. قەیسەر بە پلەی پێشەوا گەیشت، بەڵام لە بنەڕەتدا جلەوی دەوڵەت لەژێر دەستی خویدا بوو. لە ئامادە نەبوونی پێمپیۆسدا سوودی لە لاوازی ئەنجومەنی پیران وەرگرت و هاوکات بە کێبڕکێ لەگەڵ کۆماریخوازەکاندا، بووە خاوەن بڕیار بەسەر ڕۆما و هەموو ئیتالیاوە. لەماوەی چەند ساڵی حکومەتەکەیدا هەموو ناکوك و ڕکابەرە سەرسەختەکانی خۆی لەمەیدان وەدەرکردن و کەوتە سەر ئەو بڕوایەی حکومەتی کۆماری بگۆڕێت بۆ پاشایەتی. لەدوای ئەم بڕیارەی قەیسەر، کۆماریخوازەکان لەپێناوی ڕزگارکردنی کۆمارەکەیان و کوشتنی قەیسەردا پلانێکیان خستەڕوو کە بە سەرۆکایەتی کاسیۆس جێگری کراسۆس و بروتوس (بروتوس برازای کاتۆ) توانیان پلانەکەیان جێبەجێ بکەن. ئەوان بڕیاریان دا ڕۆژی جەژن (ڕێکەوتی ۱٥ مارسی ٤٤) لە ئەنجومەنی پیراندا قەیسەر بکوژن. ئەویش کە لەڕووی خەمساردیەوە، گوێی بە پاسەوانی کردن لە خۆی نەدەدا هاتە ئەنجومەنی پیران و لەوێشدا کوژرا.



خۆیدا ژەهرێك بوو تاڵایەتی کۆیلەتی لەلای ڕۆمیەکان شیرین کرد. لەدوای مەرگی *یۆلیۆس* قەیسەر هەمان ئەو خەڵکەی کە چێژی شیرینی میوانداریەکان و خێربەشینەوە و دەستبڵاویەکانی ئەویان لەبیرمابوو، لە ستایش و پێداهەڵدان و بەگەورەکردنی ئەودا لەگەڵ یەك کەوتنە کێبڕکێ. ئەوان کورسیەکانی گۆڕەپانی شار (The Forum) یان کۆکردنەوە و لەسەر یەك کەڵەکەکردن تا لەپای تەرمەکەیدا ئاگرێکی گەورە بکەنەوە و پاشانیش دیوارێکی یادکردنەوەیان لەسەر شەرەفی ئەو بیناکرد، کە لەسەر پایەکانی نووسراوێك بەم شێوەیە هەڵکەندرابوو: «باوکی میللەت». ئەوان زێتر لەوەی کە بتوانرێ بووێکی مرۆیی بەگەورە بگرن، خۆی و لاشە مردووەکەیان خەلات کرد. هەڵبەت بێجگە لەو کەسانەی کە لە کوشتنەکەیدا بەشداربوون.

ئەم ئیمپراتۆرە ڕۆمیانە هەموویان نازناوی «بەرگریکەرانی مافی خەڵك» یان هەبوو و ئەم نازناوەشیان هەمیشە دەخستە پاڵ خۆیان، چونکە لەلایەکەوە ئەم پێگەیە پیرۆز و پارێزراو بوو، لەلایەکی دیکەشەوە بەمەبەستی بەرگری و پارێزگاریکردن لە خەڵك هاتبووە ئاراوە و دیارە ئەمەش بەرژەوەندیەکانی حکومەتی دابین دەکرد. ئا بەمجۆرە ئیمپراتۆرەکان متمانەی میللەتیان بەدەست دەهێنا و خەڵك هەرگیز گومانیان لەوە نەدەکرد کە ئەوان سوودی خراپ لە پێگەی خۆیان وەرگرن. ئەمڕۆکەش کەسانێك هەن بەهەمان شێوە کاردەکەن. ئەوان هەرگیز سیاسەتێکی نادادپەروەرانە ـ تەنانەت ئەگەر ئەوەندەش گرنگ نەبێت ـ پیادە ناکەن، ئەگەر پێشتر قسەگەلێکی جوان کە هەموو شتێکی پەیوەست بەخۆشگوزەرانی خەڵك و بەرژەوەندی گشتیەوە لەخۆنەگرێ، نەدرکێنن. ئاخ، لونگا! تۆ ئەم ڕێگای کارکردنە کە ئەوان بەوپەڕی زیرەکی و لێهاتوویەوە لەکاتی تایبەتدا بەکاریان دەهێنا، باش دەناسی،

هەرچەندە بەدڵنیاییەوە لە زۆرترین بارەکاندا، پێویستی بە زیرەکی و تیژبینی نییە و تەنیا بێ شەرمی و بێ چاوەڕوویی بەسە. پاشاکانی ئاشوور و ماد بە دەگمەن لەبەرچاوی خەڵکی عامەدا ئامادە دەبوون نەبادا خەڵکە رەشۆکەکە گومان لە جیاوازی پاشاکان و خەڵکی ئاسایی بکەن. لە ئەنجامی ئەم رەفتارەوە، ژمارەیەکی زۆر لەو میللەتانەی سەر بەدەوڵەتی ئاشووری بوون، لەبەر ئەوەی گەورەکانی خۆیانیان نەدیتبوون ـ ئەوەیش کە دیبووی نەیدەوێرا باسی بکات ـ واشیان هەست دەکرد پاشا خەسڵەتگەلێکی سەرسۆڕهێن و بانمرۆیی هەیە، بەئاسانی ملکەچ دەبوون و دەبوونە فەرمانبەر. هەروەها پاشا کۆنەکانی میسریش لەبەرامبەر خەڵکدا دەرنەدەکەوتن، مەگەر لەگەڵ خۆیاندا شتێکی نامۆ بۆ نموونە ئاژەڵێك (پشیلە) یان لقی گیایەك یاخود بازنەیەکی ئاگراوی، بەسەر سەریانەوە بێت. وەك رووپۆشگەلێك سوودیان لەم کەرەستانە وەردەگرت بۆ ئەوەی رووخسارێکی جادوویی بەخۆیان ببەخشن. بەم پێیەش پاشاکانی میسر لە زەینی خەڵکی عامە و دواکەوتوودا خۆیان وەك خاوەنی خەسڵەتی نازەمینی و پیرۆز دەنواند. هەرچەندە دەتوانم ئەوەش بهێنمە پێش چاوی خۆم کە ئەم کارەیان لەو کاتەدا بووتە جێی پێکەنین و سەرگەرمی ژمارەیەك لەو زانایانەی هەمیشە لەناو خەڵکی عامەدا هەن. ژماردن و پێرست کردنی ئەو کەرستانەی پاشا و فەرمانڕەوا دێرینەکان بۆ پتەوکردن و جێگیرکردنی دەسەڵاتی خۆیان بەکاریان دەهێنان، پاشان گێڕانەوەی ئەو فرت و فێڵانەی لە دژی خەڵکانی سادە و خۆشباوەڕ ئەنجامیان دەدان و ئەوانیان پێ دەخەڵەتاندن، مرۆڤ غەمبار دەکات. لە راستیدا ئەم زۆردارانە هەرچەند زێتر بێ رێزیان بە قوربانیانی خۆیان دەکرد، ئەوان زێتر خۆیان بەدەست کۆیلەتی و دیلیەوە دەدا.



سەبارەت بەجۆرەکانی ئەو فرتوفێڵانەی لە سەردەمانی رابردوودا بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی عامە بەکاردەهاتن، لەمە زێتر دەتوانرێ چ بگوترێ؟ یەکێك لەم حاڵەتانە پەیوەندی *بە پیرهوس*[٣٣]، پاشای *ئیپیرۆس*[٣٤] ـ ەوە هەیە، کە دەیانگوت قامکگەلێکی جادوویی هەیە و بەم قامکانە دەتوانێت پەڕجۆ بکات و نەخۆشی تەبیعەتتوندی و زووڕەنجان چارەبکات. تەنانەت لەمەشیان تێپەڕاندوە و ئەفسانەیەکیان هەڵبەستووە گوایە لەدوای سووتاندنی لاشەکەی، قامکی ئەویان ساخ و دەست لێنەدراو لەناو خۆڵەمێشەکەدا دۆزیوەتەوە. ئا بەمجۆرەیە کە خەڵکانی نەزان درۆگەلێك دادەهێنن و هەر خۆیان بڕوایان پێ دەکەن. زۆرن ئەوانەی ئەم رووداوانەیان گێڕاونەتەوە، بەڵام بەجۆرێك کە بەئاسانی دەتوانین تێبگەین لە مشتێك قسەلۆك و درۆ و وڕێنە کە خەڵکی عامە دروستی کردوون و پێکیان هێناون، سەرچاوەیانگرتووە. کاتێك *ڤیسپازیان*[٣٥] لە ولاّتی ئاشوور

[33] Pyrhus (٣١٨ـ٢٧٢پ ز)، پاشای ولاّتی ئەپیرۆس Epirus لە ساڵی ٢٩١دا مەکدونیای داگیرکرد وەلێ لە ساڵی ٢٨٦دا لەوێ ناچار بە پاشەکشێ کرا. ساڵی ٢٨٠ یارمەتی تارینتۆمی دا تا ئیتالیا داگیر بکات و لە هیراکلیا توانی بەسەر رۆمیەکاندا زاڵ بێت، بەڵام زیانێکی ئەوتۆ بە سوپاکەی کەوت کە بووە هۆی ئەوەی ئەم رستە بە ناوبانگەی لەزار بێتەدەر: «سەرکەوتنێکی دیکەی لەم بابەتە بەسە تا بۆ هەمیشە تێکبشکێم». پیرهۆس لە ساڵی ٢٧٥دا بەدەستی رۆمیەکان تێکشکا و دیسان گەڕایەوە مەکدونیا و لە ساڵی ٢٧٣دا ئانتینۆگۆسی دووەمی رووخاند و لە ئەنجامیشدا لە ئارگۆس کوژرا.

[34] Epirus ولاّتێکی کۆن کە کەوتووتە یونان لەسەر دەریای ئیجە.

[35] Vespasian (٩ـ٧٩ ز) یەکەمین ئیمپراتور لە زنجیرەی فلادیۆس کە لە ساڵی ٦٩ تا ٧٩ز ئیمپراتوری رۆم بووە. لە سەرەتادا لەلایەن کلودیۆسەوە کرایە میری لژیۆن و بۆ ئەلمانیا و بەریتانیا نێردرا. ساڵی ٥١ ز بووە قونسۆل و لە ساڵی ٦٣ ز بووە بالوێز لە ئەفریقا. ساڵی ٦٦ز رەوانەی جەنگ لەگەڵ یەهودیەکامن کرا و ساڵی ٦٩ز لە ئەسکەندەریە سەربازەکان بە ئیمپراتور هەڵیان

دەگەڕاوە، لە ڕێگەیدا بۆ ڕۆم، بۆ دەستبەسەرداگرتنی ئیمپراتۆریەت بە ئەسکەندەریەدا تێدەپەڕێت و چەند کارێکی نائاسایی ئەنجام دەدات: کەمئەندامان چاك دەكاتەوە، بینایی نابیناكان دەگەڕێنێتەوە و زۆر پەڕجۆی دیكەی لەم بابەتە.. كە بەبڕوای من، ئەو نەزانە ئاسانباوەڕانە كوێرتربوون لەو نابینایانەی چاك بونەوە. زۆرداران خۆشیان سەریان سوڕماوە لەوەی ئەم هەموو خەڵكە چۆن دەتوانن بەرگەی زۆر و ستەمكاری یەك كەس بگرن" ئەوان لەپێناوی پاراستنی خۆیان لەئاست خەڵكدا ڕوودەكەنە ئایین و جاری واش هەیە لەپێناوی ئاراستەكردنی ڕەفتارە نامرۆڤانەكانیاندا سوود لە عەبای كاهینی وەردەگرن. لە سیبلەدا بەرهەمی *ڤیرژیل*، *سالمۆنێ* بەو هۆیەی دەیویست لاسایی *زیۆس* بكاتەوە تا خەڵكی هەڵخەڵەتێنێ و بیانتۆقێنێت، بووە جێی توڕەیی ئەو و بەمەرگ مەحكوم كرا و لە واقیعیشدا سزای ڕەفتارە ستەمكارەكانی لە خوارترین پلەی دۆزەخدا وەرگرت.

ئەگەر كەسێكی ئاوا لە سەردەمی خۆیدا تەنیا بەهۆی پەنابردنی بۆ ئەم كارە دەبەنگانە، تا ئەو ئەندازەیە شایستەی دۆزەخ و ئەشكەنجەكانیەتی، من لەو بڕوایەدام ئەو كەسانەی سوود لە ئایین وەردەگرن وەك سەرپۆشێك بۆ داپۆشینی ناشیرینیەكانیان زیاد لەوانی دیكە شایستەی دۆزەخن.

فەرمانڕەواكانی فەرەنساش سوود لەو جۆرە ئامرازانە وەردەگرن، بۆ نموونە لە كاسەلێس و ستایشكاران[١]، بادی (قاپ) پیرۆز و ئاڵاگەلێك كە

بژارد. لە ڕووداوە گرنگانەكانی ئیمپراتوریەكەی بریتین لە سەركوتكردنی شۆڕشی باتاویەكان (٦٩ـ ٧٠ز) داگیركاریەكانی بەریتانیا و هەروەها شانۆی ئامفی لە ڕۆمای پایتەختی ئیتالیا.

[1] Fleurs-de-lys گوڵە سەوسەنی سێ پەڕ نیشانەی بنەماڵەی پاشایەتیە لە فەرەنسای كۆندا.



نیشانەی بڵێسەی زێڕینیان بەسەرەوە بوو. لەگەڵ ئەمەشدا، بۆی هەیە گومانتان لەم گوتەی من هەبێت، وەلێ حەزناكەم ئەم واقعیەتە هەرچەند و تا هەر ئەندازەیەكیش دروست بێت گومانتان لێی هەبێت، چونكە لەو پێڕەوەی ئێمەدا گومان جێگای نابێتەوە. پاشاكانی ئێمە لە كاتی ئاشتیدا ئەوەندە خۆڕاگر و پایەبەرزبوون و لەكاتی جەنگیشدا ئەوەندە چاونەترس و بێباك بوون كەوا دەدەكەوێت خۆڵقەتی ئەوان جیاوازە لەهی كەسانی دیكە و یەزدانی تاك ئەمانەی تەنێ بۆ حكومەت و پاراستنی پاشایەتی دروست كردووە. تەنانەت ئەگەر ئاواش نەبێ، مەبەستم نییە ڕاستی و هەقانیەتی یاساكانی ڕابردووی وڵاتەكەمان بخەمە ژێر پرسیارەوە. هەروەك چۆن نامەوێت هەموو ئەو ڕابردووە بە یەكجاری ڕەتبكەمەوە و لەخۆباییبوون و شانازیە بەیادگار ماوەكانی ئەو سەردەمانە لەبەر چاو نەگرم. لە مێژووی ڕابردووی ئەم وڵاتەدا، زەمینەیەكی هێندە گونجاو هەیە بۆ پشكوتنی شیعری فەرەنسی كە نەك هەرجێی شانازیە، بەڵكو بەسەرهەڵدان و پەیدابوونی *ڕۆسنار*، *بائیف* و *بلی*، ئەم مێژووە دووبارە دەژیێتەوە. ئەم شاعیرانە ئەوەندە بەباشی بەرگرییان لە زمانی ئێمە كردووە و دەكەن كە دەتوانم بوێرانە بڵێم بەزوویی لەم بوارەشدا پێش یۆنانی و ڕۆمیەكان دەكەون و جگە لە دەسپێشخەری ئەوان شتێكی دیكەیان بۆ ناهێڵنەوە. لەوانەیە لەبارەی «نەزم»ی فەرەنساوە بەهەڵەدا چووبم (بەباشی دەزانم لەجیاتی شیعر، وشەی «نەزم» بەكار ببەم، هەرچەندە زۆر كەس ئەمڕۆ بەشێوەیەكی میكانیكی وشەكێشدارەكان ـ موزون ـ دادەهێنن؛ من كەسانێك دەناسم لە توانایاندایە شیعر بەكەماڵ بگەینن و شكۆی ڕابردووی بۆ بگەڕێننەوە) بەڵام بەهەمان شێوەی كە گوتم مەبەستم نییە ئەفسانە شیرنەكان، بۆ نموونە لەبارەی *شاكلۆڤیش*، بێ نرخ پیشان بدەم، بەڵام پێموایە هەر لە ئێستاوە بتوانین دەسنیشان بكەین كە

هێزی خەیاڵی *رۆسناری* ئێمە لەبەرهەمەکەیدا Franciade دەبێت. من ڕێزم بۆ بڵندفڕی و سروشتی دەوڵەمەندی ئەو هەیە، ئاشنام بە رۆحە پڕجۆش و خروشەکەی، ئاگاداریشم لەسەرنجراکێشیەکانی: ئەو بەهەمان شێوەی کە رۆمیەکان (بەپێی شیعرەکانی *ڤیرژیل*) ستایشی ئەو قەڵغانانە دەکات کە لە ئاسمانەوە دابەزیون، ستایشی پەرچەمی پیرۆزی فەرەنسا لە شیعرەکانیدا؛ ئەو بەهەمان شێوەی کە ئەسینایییەکان سەبەتەی «*ئەریکتۆنیۆس*»[1] یان دەپەرست، شوشەی روونی پیرۆز رووبەڕووی پەرستن دەکاتەوە؛ ئەو لەبەر خاتری دلێریەکانمان، ستایش و دەستخۆشیمان لێ دەکات، بەهەمان شێوەی کە ئەسینایییەکان ڕێزیان لە تاجی گوڵی زەیتون دەنا و بانگەشە دەکەن کە ئەم شتە هێشتاش لە

[1] Erichthonius' یەکێکە لە یەکەمین پاشاکانی ئەسینا. سەبارەت بە رەچەڵەکی ئەو هەواڵگەلێکی جۆراوجۆر بەدەست گەیشتوون. زۆربەی نووسەرەکان لەو بروایەدان کە ئەو لە ئەنجامی ئەڤینی هیفایۆستۆس بۆ ئاتینا لەدایك بووە. ئاتینا بەبێ ئاگاداری خواوەندەکان ئەم منداڵەی (لەناو سەبەتەیەکدا) خستووتە پەرستگایەکەوە و بەیەکێك لە کچەکانی بکروسی سپاردووە. کچەکان لەڕووی خۆتێهەڵقوورتاندنەوە سەبەتەکە دەکەنەوە و منداڵێ دەبینن کە دوو مار پاسەوانی لێدەکەن. بەپێی هەندێ لە گێڕانەوەکان بەشی خوارەوەی منداڵەکە وەك زۆرینەی ئەو گیانەوەرانەی لەزەویدا لەدایك دەبن لە شێوەی کلکی مارێکدا بووە یان بە گوتەیەکی رەها هەر کە سەبەتەکە دەکرێتەوە منداڵەکە لە شێوەی مارێکدا هەڵدێت و پەنا دەباتە پشت ئاتینا. کیژە لاوەکان لە ترسان شێت دەبن خۆیان لە خەرەندەکانی ئەکروپۆلیسەوە هەڵدەدەنە خوارێ و دەمرن. ئاتینا لە باغی پەرستگا پیرۆزەکەیدا کەوتە پەروەردەکردنی ئەرکیتۆنیۆس ماوەیەکیش لەوەو دوا سکروپس دەسەڵاتی پاشایەتیەکەی بەو سپارت.



تاوەری *مینەرڤا*[36] دەبینرێت. هەڵبەت پێویستە زۆر بێ شەرم بم کە بمەوێت لەکەیەك لە پێشینە مێژووییەکانی وڵاتەکەم بدەم و بەم هزرانەوە، حەرەمی شاعیرەکانمان ببەزێنم.

دەگەڕێمەوە سەر گوتەکانم، زۆرداران هەمیشە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان بەهێزبکەن، دەستیان بۆ هەموو کارێك بردووە تاکو نەك تەنیا وا لە خەڵکی بکەن خوو بە گوێڕایەڵی و کۆیلەتیەوە بگرن، بەڵکو ناچاریان بکەن ئافەرین و ستایشیان بکەن. کەواتە، هەموو ئەوەی تا ئێستا لەبارەی هۆکار و ئامرازەکانی ملکەچی کردنی خۆبەخشانە و رەزامەندانە باسم کرد، لە رەفتاری دیکتاتورەکان لەگەڵ ژێردەستەکان و چینەکانی خەڵکی عامەدا راستە.

[36] Minerva، خواوەندێکی رۆمیە کە بەراورد کراوە بە ئاتینای یۆنانی. واپێدەچێت ئەم خواوەندە یەکێك نەبێت لە خواوەندە زۆر کۆنەکانی لاتین. سەرەتا لە ئیترووریە سەریهەڵدا و هەمان پێگەی ژۆپیتەر و ژنۆنی هەبوو. ئەرك و دەسەڵاتەکانی ئەم خواوەندە لە شێوەی ئەرك و دەسەڵاتی ئاتینای یۆنانیدا بوون. ئەو سەرپەرشتیکردنی کارە مەعنەویەکان بەتایبەتیش پەروەردە و فێرکردنی لە ئەستۆ بوو.

## بەشی سێیەم

ئێستا دێمە سەر خاڵێك كە پێموایە هۆكاری بنەڕەتی و رازی دەسەڵاتخوازی لە خۆیدا هەڵگرتووە و بنكە و هۆكاری هێشتنەوەی ستەمكاریە. ئەگەر كەسێك وابیربكاتەوە كە رموەشێنەكان، تیرهاوێژەكان، پاسەوانەكان، چاودێرەكان.. هتد. بەرگریكەران و راگرانی ستەمكاری و جەلادەكانن زۆر بەهەڵەدا چووە. ئەم كەسانە زێتر بۆ پیشاندان و رێوڕەسمی تەشریفاتی و نمایشكردنی دەسەڵات بەكاردێن و بەهیچ شێوەیەك ئامرازی پارێزگاری كردن و گەرەنتی ستەمكاری نین. ئەو رموەشێن و پاسەوانە چەكدارانەی لەبەردەم دەروازەی كوشكەكاندا دەوەستن، تاكە رێگری لە چوونە ژوورەوەی هەژارە بێ چەكەكان بكەن، نەك ئەو پیاوە چەكدارانەی نەخشەیەكیان لەسەردا هەیە. خراپ نییە بزانین كە تەنیا ژمارەیەكی كەم لە ئیمپراتۆرەكانی رۆم لەژێر پارێزگاری پاسەوانەكانیان لە مەترسی رزگاریان بووە و زۆرینەیان لەلایەن رموەشێنەكانی خۆیانەوە كوژراون. (١٨) دەستەی سوارە، ئەفسەرە پیادەكان و پیاوانی چەكدار نین  بەرگری لە كۆڵەگەكانی هێزی ستەمكار دەكەن. بۆی هەیە ئەم گوتەیە لە یەكەم جاردا جێی بڕوا نەبێت، بەڵام راستیەكەی ئەوەیە تەنیا چوار یان پێنج كەس لە نزیكەكانی پاشا گرەنتی مانەوەی دەكەن و هەر ئەم چەند كەسە بە ژمارە كەمانەش دەبنە هۆی بە كۆیلەكردنی گشت دانیشتووانی ئەو سەرزەمینەی ستەمكار فەرمانڕەوایە بەسەریەوە.



ئەمانە پەیوەندیەكی نزیكیان بەپاشاوە هەیە و لە هەموو تاوان و تاڵانكاریەكانیدا هاوبەشن، بەهەمان رادەش بەشدارن لە خۆشگوزەرانی و عەیش و نۆشەكاندا. ئەم چەند كەسە بەڕادەیەك بەسەر پاشاكەیانەوە باڵادەستن، كە دواجار خودی پاشا نەك هەر تەنها بەرپرسیارە لەسەرپێچیەكانی خۆی، بەڵكو دەبێتە وەڵامدەرەوەی سەرپێچییەكانی ئەوانیش! ئەم شەش كەسە، شەش سەد بەرتیلخۆر و بەكرێگیراویان هەیە كە ئەوانیش بەنۆرەی خۆیان وەك شەریكە تاوان و هاودەست حسابیان بۆ دەكرێ و هەمان ئەو جۆرە پەیوەندیەی لەنێوان ستەمكار و شەش كەسەكەدا هەیە لەنێوان ئەم شەش سەد كەسە و ئەو شەش كەسەشدا هەیە. بەم شێوەیە، شەش هەزار كەس لەژێر فەرمانی ئەو شەش سەد كەسەدا سەرقاڵن بە راپەڕاندنی كاروباری وەك ئیدارە و كۆنترۆڵكردنی كاروباری ویلایەتەكان و شارەكان و هەروەها كۆكردنەوەی باج و سەرانەكان و تاڵانكردنی سامانی خەڵك. ئەمانە هەرەمە راپەڕێنەرەكانی زەبروزەنگ، توقاندن، سامان پێكەوەنان، تاڵان و زۆردارین. هێندەش نەفرەت لێكراو و یاساشكێنن كە لەژێر سێبەری پارێزگاریكردنێكی نایاسایانە و دەسەڵاتی چینەكانی لەسەروو خۆیانەوە نەبێت، ناتوانن خۆیان لە سزا و یاساكان دەرباز بكەن.

ئەنجامی هەموو ئەوەی باسمان كرد شتێكی كارەساتاویە. ئەگەر ئەم گلۆڵە ئاڵۆزكاوەش بكەینەوە دەبینین نەك هەر تەنیا شەش هەزار بەڵكو سەدەها و ملیۆنان كەس بە هۆی سەرەداوەكانیەوە پەیوەستن بەخودی زۆردارەوە. بەپێی گێڕانەوەی هۆمێر، یەكێك لە سەروەرییەكانی ژۆپیتەر ئەوە بوو كە هەموو خواوەندەكان بەهۆی زنجیرێكەوە بەسرابوون بەوەوە و ئەویش دەیتوانی بە تەكاندنی زنجیرەكە هەموویان بەرەو لای خۆی پەلكێش بكات. ئەم نموونەیە هۆكارێك بوو تا ئەنجومەنی سەنای دەوڵەتی

یۆلیۆس قەیسەر فرەوان ببێت، پلەوپایەی نوێ سەرهەڵدەن و فەرمانگەگەلێك بكرێنەوە؛ هەڵبەت ئەمەش نەك لەپێناوی چاككردنی بونیادی دادپەروەری بەڵام بۆ دەستەمۆكردنی چەند پشتیوانێكی نوێ بۆ ستەمكاری.

بەكورتی، كاتێك بەم واقعیەتە دەگەین كە لەژێر سێبەری زۆردارێكدا هەندێك سوود و قازانجی كەم تا زۆر بەنەسیبی كەسانێك دەبێت، هەمیشەش ئەو كەسانە دەبینرێنەوە كە پێیانوایە ستەمكاری پێویست و رەوایە؛ رێك بەو جۆرەی كە ئازادی لە روانگەی ئازادیخوازانەوە پێویستە. پزیشكەكان لەو بڕوایەدان كاتێك شوێنێك لە لەشدا تووشی دەردێكی وەك «گولی» دەبێت، ئەم نەخۆشیە بەخێرایی پەلدەكێشێ بۆ ئەو بەشانەی دیكەی لەش كە زیانیان پێ گەیشتووە یاخود لاوازبوون. بەهەمان شێوە، هەركاتێ فەرمانڕەوایەك دەبێتە دیكتاتور، هەموو كاسەلێس و شەقاوەكانی ناو میللەت (هەڵبەت مەبەست دز و چەتە و گوێبڕەكان نین كە رۆڵیان نییە لە چاكی و خراپی دەوڵەتی كۆماریدا) و هەموو ئەو كەسانەش كە بەدوای هەلێكدا دەگەڕێن تا پلەوپایەخوازی و چاوچنۆكی خۆیان بهێننەدی، لە دەوری ئەو دیكتاتۆرە خڕدەبنەوە تاكو بەشێكیان لە غەنیمەتەكان دەسكەوێ و دەستیان بە پلەوپایەیەكی هەرچەندەش لاوەكی رابگات. شێوەی ئیشكردنی هەموو دزە بەدناو و دزە دەریاییە ناودارەكانیش بەم جۆرەیە: هەندێكیان گشت سەرزەوی بەپێ دەگەڕێن، هەندێكیان دەكەونە تاقیبكردنی رێبواران؛ هەندێكیان بۆسە دادەنێنەوە، هەندێكی دیكە بەدزیەوە چاودێری هەموو هەڵسوكەوتێكی خەڵكانی دیكە دەكەن؛ ژمارەیەك دەست دەدەنە تاوانكاری، هەندێكی دی دەكەونە دزی كردن؛ ئەگەرچی لەڕووی پلەوپایەوە جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا ـ بەجۆرێك هەندێكیان تەنیا وەك ژێردەست و ئەوانی دیكەش بەزۆری سەركردە و



سەرۆكن ـ وێڕای ئەوەش هیچ كامێك لەوانە نابینرێن كە پشكێكی بچووكی لە غەنیمەتەكان بەدەست نەهێنابێت. دەگێڕنەوە دزە دەریاییەكانی دوورگەی سیسیلیا لەڕووی ژمارەوە ئەوەندە زۆربوون كە پێویستی دەكرد بۆ رووبەڕووبوونەوەیان پۆمپیۆسی گەورە رەوانەبكەن. هەروەها گوتویانە ئەمانە شارگەلێكی جوان و گەورەیان دەكردنە هاوپەیمانی خۆیان تا لە رێگەی گەڕانەوەیان لە هێرشەكانیان، پەنا بۆ بەندەرەكانی ئەم شارانە ببەن و لە بری ئەمەش، هەر لەو سامانە دزراوەی لەگەڵ خۆیان دەیانهێنایەوە بڕێكی بەرچاویان پێ دەدان.

بەمجۆرە زۆردار، بەشێوەیەكی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ژێردەستەكانی خۆی دەخاتە ژێر كۆنترۆڵەوە و هەر لەلایەن ئەم بازنەیەشەوە پارێزگاری لێدەكرێت؛ رێك بەو جۆرەی بۆ قڵشاندن و بڕینەوەی دارێك، دەبێت سوود لە تەلزمێكی ئەو دارە خۆی وەرگرن. تیرهاوێژ، پاسەوان و بەرگریكەرانی ستەمكاریش بەم شێوەیەن. هەڵبەت، ئەمانەش بۆ خۆیان لە زوڵم و ستەمی زۆردار دەربازیان نابێت، بەڵكو لەلایەن خەڵكیشەوە بە نەفرەت دەكرێن و یەزدانیش لێیان توڕەیە. ئەمانە رێگەیان پێدراوە هەموو ستەمێك بكەن، نەك لەدژی ئەوەی كە ئەوان دەچەوسێنێتەوە بەڵكو دژی ئەو كەسانەی بۆ خۆیان گەرەكیانە ملكەچ بن و ببنە كۆیلە. بەهەرحاڵ، من بەبینینی ئەو مرۆڤانەی بەشێوەیەكی سوك و كەموكورتانە لەپێناو بەدەسهێنانی مشتێ پارەدا دەبنە نوكەر، هەردەم سەرم دەسوڕمێ و پەژارە دام دەگرێ لە ئاست نەگبەتی و بەدبەختی و سوكی ئەم دەستەیەدا. ئەمەش لەبەرئەوەی جگە لە گەمژەیی دەتوانین چ هۆكارێكی دیكە بدۆزینەوە كە هەندێ خەڵك بەهۆیەوە لە ئازادی خۆیان دوور دەكەونەوە و لە ستەمكار نزیك

دەبنەوە؟ بەدەربڕینێکی تر، گەمژەییە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ بەپێی خۆی بەرەو قۆرت بڕوات و بەئامێزی کراوەوە، کۆیلایەتی پەسەند بکات.

ئەگەر ئەم کەسانە بۆ تەنیا ساتەوەختێك پایەخوازی و چاوچنوکی و تەماعی خۆیان وەلاوەبنێن و لە واقعیەتی خۆیان بڕوانن، بەڕوونی تێدەگەن کە گرفتارترن لە هەموو ئەو بێچارانەی لە ژێر شەقی ستەمکاری و زۆرداریدا دەپلیشێنەوە. جووتیاران، پیشەوەران، پیشەسازان و زەحمەتکێشان هەرچەندەش کوت و بەندکرابن، تەنیا فەرمانەکان جێبەجێ دەکەن و ملکەچی بڕیارەکانن؛ بەڵام ئەوان (نزیکەکان و بەرتیلخۆرانی زۆردار) ناچارن لە مانیش زێتر خزمەت بەزۆردار بکەن؛ ئەوان نەك هەر تەنیا ناچارن ملکەچی دەستورەکان بن، بەڵکو دەشبێ ئاگایان لە وەبێ بچووکترین جوڵە بەپێچەوانەی حەزی ستەمکارەوە ئەنجام نەدەن. ئەوان ناچارن خوڵق و مەیلەکانی ستەمکار بناسن و پێشبینی خواستەکانیشی بکەن. دەبێت بەتەواوەتی بوونی خۆیان لەبیر بکەن و لە خزمەتی پاشادا بن و خۆیان ئازار بدەن بۆ رازیکردنی زۆردار، لەژێر کارە قورسەکاندا بمرن و خۆشی ئەو بەخۆشی خۆیان و نا ئارامی ئەو بە نائارامی خۆیان بزانن، هەروەها هیچ ویست و هەڵبژاردنێکی خۆیانیان نەبێت؛ نابێت خاوەنی کەسایەتی خۆیان بن، مافی هەڵبژاردن و تەنانەت سەلیقەیەکی تایبەت بەخۆشیان هەبێت. دەبێت بەدڵ و گیان گوێ لە هەموو قسەکانی زۆردار بگرن. بۆ هەر ئاماژەیەکی ئەو ئامادەبن و خۆیان لەگەڵ حاڵەت و خووەکانی ئەو رابهێنن. وەك ئەوەی بڵێی ئەوان چاو و گوێچکە و دەست و پێ و ئەقڵ و هەستیان نیە.

ئایا دەتوانین بەمە بڵێین ژیان؟ ئایا ئەم ژیانە دڵخۆشکەرە؟ ئایا لە دنیادا شتێك هەیە لەمە زێتر شیاوی بەرگەگرتن نەبێت؟ ئەویش نەك هەر بۆ کەسانێکی بەتوانا و بەجەرگ و بەئیرادە، بەڵکو بۆ مرۆڤێکی ئاسایی و



بۆ کەسێك کە تەنیا بە رواڵەت مرۆڤە؟ کامە بەدبەختی لەوە گەورەترە مرۆڤ هیچ شتێکی خۆی نەبێت و وەك گەنە بەئەوی دیکەوە نووسابێت و هەم خۆراکی لێوە بمژێ و هەم ناسنامەشی لێوە بەدەست بێنێت؟

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا کەسانێك لەپێناوی بەدەستهێنانی سامان و پارەدا، کۆیلایەتی و ملکەچی قەبووڵ دەکەن و ئامادەن هیچ پایە و سەربەخۆییەکیان نەبێت و بە بەشێك لە موڵك وماڵی زۆردار لە قەڵەم بدرێن. بەڵام ئەوان بەجۆرێك رەفتار دەکەن وەك ئەوەی ئەم سامانە هی خۆیان بێت، بیریان دەچێتەوە کە ئەوە خودی ئەوانن ئەو هێزەیان بەزۆردار بەخشیوە کە توانای پێدەدات بوون و نەبوونی ئەوان لەوان وەرگرێت و هیچ شتێ بۆ کەس نەهێڵێتەوە. ئەوان دەزانن هیچ شتێك جگە لە تەماعی سەروەت و سامان زێتر ناتوانێت مرۆڤەکان ناچار بەقەبووڵ کردنی ملکەچی و بەندایەتی و زۆرداری بکات. ئەوان دەزانن لە روانگەی زۆردارەوە، هەبوونی سامان (بۆ ژێردەستەکان) گەورەترین تاوانە؛ ئەو تاوانە کە تاوانکارەکەی شیاوی مردنە. ئەوان دەزانن زۆردار زێتر لەهەر شتێ حەزی لە سامان و پارەیە و لەم نێوەشدا توانای بەرگەگرتنی رەقیبی نییە و تەنیا ئەو کەسانەی پێ قووت دەچێت کە لە بەردەمی خۆیدا دەکەونە سەرچۆك و لەپێناوی پارویەك ناندا دەستیان پاندەکەنەوە. دەروبەر و نزیکەکانی زۆردار بێهودە پشت بە کەسانێك دەبەستن کە لەژێر ستەمی ستەمکار و بەهۆی نۆکەری کردنیەوە سامانێکی زۆریان دێتە دەست. پێویستە ئەوان سەرنج لەوە بدەن کە چەندە لەم بەراتیلخۆرانەی بۆنەتە خاوەن پارە و لە پاراستنی سامانی خۆیاندا سەرکەوتووبوون، کاتێك مێژووی رابردوو و هاوچەرخ هەڵدەدەینەوە بەڕوونی کەسانێکی بێ ئەژمار دەبینین لە رێگای ناتەندروست و ناشرینەوە خۆیان لە پاشا و پاشازادەکان نزیك دەخستەوە

(چ ئەوانەی کە پاشا سوودی لە خراپییەکانیان وەردەگرت و چ ئەوانەشیان کە لە ساکاری و ساویلکەییان) بێجگە لە ئابڕوچوون و نابودی، هیچ چارەنووسێکی تریان نەبووە، هەرچەندەش ئەم خزمەتکارانە لەسەرەتاوە لوتف و کەرەم و سەخاوەتی پاشایان بەسەردا بارییوە، هێندەی نەبردووە بوونەتە نیشانەی تورەیی و نادادپەروەری پاشا و بەرەو گەندەڵی ڕاپێچ کراون. هەڵبەت لەناو ئەم جۆرە کەسانەدا کە سەردەمانێك پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ فەرمانڕەوا ستەمکارەکاندا هەبووە، کەسانێکی کەم دەدۆزرێنەوە بێ رەحمی و توندی زۆرداریان لە ئاست خۆیاندا نەبینیبێت، هەمان ئەو توندی و بێبەزەییەی کە خودی خۆیان لە ئاست ئەوانی دیکەدا پیادەیان کردووە، زۆربەی کات ئەم کەسانە کە لەسایەی زۆرداردا دەکەوتنە تالانکردنی خەڵك و لەم ڕێگەیەشەوە دەوڵەمەند دەبوون، بۆ خۆشیان لە کۆتاییدا گرفتاری هەمان چارەنووس دەبوونەوە.

تەنانەت مرۆڤە بەرچاو و خاوەنناسنامەکانیش (کە بەدەگمەن زۆرداران حەزیان لێدەکەن و پشتیوانیانن) ناتوانن بۆماوەیەکی دوورودرێژ بەرگەی زۆر و ملکەچی ئەوان بگرن و بەخێرایی پەی بە مەترسییەکانی ستەمکاری لە دژی بەرژەوندییەکانی خۆیان دەبەن. *سێنیکا*[37]،

[37] Seneca لۆکیۆس ئانایۆس Lucius Anaeus (٤پ ز ـ ٦٥ز)، فەیلەسووفی رۆمی، کوڕی سێنیکا. ئەو پەروەردەکەری نیرۆن، ئیمپراتوری رۆم بوو. لە فەلسەفەدا هەمان بیروباوەری رەواقیەکانی هەبوو. نامەگەلێکی لەبارەی ئامۆژگاری و ئەخلاقەوە هەن کە بەناوبانگن. رەخنەگران، پێیانوابوو کرداری لەگەڵ گوتەکانی وێکناکەنەوە، بەڵام زۆرکەس لەو باوەڕەدان رەفتارجوانی نیرۆن، لەساڵەکانی سەرەتای پاشایەتیدا، لە ئەنجامی پەروەردەی ئەم فەیلەسووفەوە بووە، بەڵام خووی دڕندانە و ستەمکردن زاڵ بوون بەسەر میزاجی نیرۆن دا و ئەو تاوانانەی ئەنجامی داون لە مێژوودا تۆمارکراون و مایەی سەرسامین. لەوانەش ئەوەی چاودەبڕێتە فەزل و پێگە و ئیعتیبار و سەروەت و



*بورۆس*[38]، *تێریزا*[39] لەو پیاوە هیمەتبڵندانە بوون کە بەم دەردە موبتەلابوون، دووان لەمانە لە بەختڕەشی و بەهۆی ئەو توانایەی هەیانبوو بێ رەزامەندی خۆیان بانگهێشت کران بۆ کوشکی دەربار تا کاروباری فەرمانڕەوا بگرنە ئەستۆ هەردووکیشیان خۆشەویست و جێ پەسەندی زۆردار بوون. تەنانەت یەکێك لەوانە گەورەکەی خۆی وەك منداڵ گیرۆدەی خۆی کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، مەرگی بێ بەزەییانە و دڵتەزێنی ئەمانە بەڵگەیە بۆ ئەو راستییەی دەڵێت لە هاوڕێیەتی کردنی زۆردارێکی خوێنخۆردا هیچ بوارێك بۆ متمانە نییە. هەر بە راستیش لە کەسێکی دڵرەق کە تەنانەت لە هاوچەشن و ژێردەستەکانی خۆشی وێرای

سامانی پەروەردەکەرەکەی سێنیکا، فەرمانی پێکرد دەمارەکانی خۆی ببڕێتەوە. فەیلەسووف جگە لە ملکەچی چارەیەکی نەبوو و بە دەستی خۆی، بەندی ژیانی خۆی بڕی.

[38] Burrus Sextus Afranius(٦٢ز) بورۆس و سێنیکا لە راوێژکارە یەکەمەکانی ئیمپراتور نیرۆن بوون. بورۆس لە ساڵی ٥١ تا ٦٢ زایینی لە خزمەتی سەرۆکی گاردی پاسەوانی ئیمپراتور دابوو. ئەرکی بەرێوبەرایەتی کۆمیتەکانی سوپای رۆم لە ئەستۆی ئەو دابوو. بورۆس هاوشان لەگەڵ سێنیکا توانی لە هێز و دەسەڵاتی ئاگریپینا (دایکی نیرۆن) کەمبکەنەوە" ئەم دوو سەرکردەیە هەموو سیاسەتەکانی ئیمپراتور و کاروبارە راپەڕاندنییەکانیان بەخۆیان بەڕێوە دەبردن. بەپێی گێڕانەوەکان، نیرۆن ژەهری دەرخواردی بورۆس دا و کوشتی.

[39] Publius Clodius Thrasea Paetus (٦٦ز)، سیناتوری رۆمی کە بەهۆی دژایەتی لەگەڵ نیرۆن ناوبانگی دەرکردووە. ترازیا لە سەردەمی ئیمپراتور نیرۆن چەند لایەنێکی جیاوازی لە ئەستۆ گرت. کاتێك کە ئەنجومەنی پیران، مەرگی دایکی نیرۆنیان لێ پیرۆز کرد، ترازایا لە باری نارەزاییدا ئەنجومەنی پیرانی بەجێهێشت. ئەو زۆر دژی بێسەروبەرییە ئەخلاقیەکانی نیرۆن بوو. لەساڵی ٦٦ دوژمنەکانی بڕوایان بە نیرۆن هێنا کە بڕیاری کوشتنەکەی دەربکات، چونکە ترازایا وەك دوژمنێکی سیاسی شێلگیر و ترسناك دەرکەوتبوو. دوا گوتەکانی ئەو بەر لە مردن لە بارەی ژیان و نەمری روحی مرۆڤەوە، تۆمار کراون.

ملکەچییان، بێزارە؛ دەکرێ چاوەڕوانی چ دۆستایەتی و خۆشەویستییەك بکرێت؟ هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، زۆردار لەبەر ئەوەی ناتوانێت چۆن خۆشەویستی بنوێنێ، ئەوا لە کۆتاییدا خۆی و ئیمپراتۆریەتەکەشی گەندەڵ دەکات.

ئێستا لە وەڵامی کەسێکدا کە بانگەشە دەکات ئەوان بەهۆی راستگویی و کارجوانییەوە بەو چارەنووسە گەیشتوون، پێویستە بگوترێت، کەمێکیش تەماشای ئەو کەسانە بکات کە نزیك بوون لە هەمان زۆردارەوە و بەچاوی خۆی ببینێ کە ریاکار و کاسەلێسەکانیش چارەنووسێکی باشتریان لە چارەنووسی ئەو سێ کەسە نەبووە. چ کەسێك دەناسیت کە هێندەی نیرۆن تامەزروو و گرێدراو و ئاشق و شەیدای ژنێك بووبێت؛ بەو ئەندازەیەی ئەو گیرۆدەی پۆپایادا ببوو؟ وێرای ئەمەش هەر ئەو بۆ خۆی خۆشەویستەکەی دەرمانخوارد کردو کوشتی. دایکی *نیرۆن* کە ناوی *ئاگریپینا* بوو، مێردەکەی خۆی بەناوی کلۆدیۆس کوشت تا کوڕەکەی بگا بە پێگەی ئیمپراتۆر! ئەم دایکە لەپێناو ئەوەی کوڕەکەی دڵخۆش بکات دەستی لە هیچ توندیەك نەگێڕایەوە. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، ئەو کوڕە خۆشەویستەی، دایکی گەیاندبوویە دەسەڵات، لەدوای چەند هەڵەیەکی ئەم دایکە، ئەوی کوشت؛ ئەگەرچی ئەم دایکە کوژراوە شایستەی مردنێکی لەو جۆرە بوو، بەڵام نەك بەدەستی جگەرگۆشەکەی بەڵکو بەدەستی کەسێکی دیکە. چ کەسێك لە نێو ئیمپراتۆرەکاندا گەمژەتر و ساویلکەتر لە کلۆدیۆسی یەکەم بینراوە؟ چ کەسێك هێندەی ئەو وەك مۆمێك بووە لە دەستی ژنەکەیدا کە ناوی *مەسالینا*[40] بوو سەرەنجامیش

[40] Massalina ڤالریا ماسالینا (٤٨ز مرد)، هاوسەری کلۆدیۆسی یەکەم، ئیمپراتوری رۆم کە بەبڕیاری ئەو خرایە بەر دەستی جەلاد و کوژرا.



هەر بەدەستی خۆی خستییە بەردەستی جەلاد؟ گەمژەیی زۆردار هەمیشە ئەو لە ئاست چاکەکاریدا دەستەوەسان دەکات. بەڵام هەر ئەم زۆردارەش بەو کردارە بێ بەزەیی و دڕندانەی لە ئاست نزیکەکانی خۆیدا دەینوێنێت، دەیسەلمێنێ تا چ رادەیەك بێ بەهرەیە لە هەست و زانایی.

رستەیەکی راچڵەکێنەری بەناوبانگ هەیە کە لە زمانی یەکێك لەم زۆردارانەوە بەهاوسەرەکەی گوتراوە؛ زۆردارێك کە بەئەشقێکی زۆرەوە تەماشای گەردەنی مەعشوقەکەی کردو لە کاتی نەوازشکردنیدا پێی گوت: «بەسە تەنیا ئاماژەیەك بکەم تا لە چاوتروکاندنێکدا ئەم گەردەنە جوان و سەرنجڕاکێشە ببڕدرێت». هەر لەبەر ئەوەش بووە کە دیکتاتورەکانی سەردەمانی پێشوو بەهۆی ئەو ترس و توقاندنەی لە دڵی نزیکەکان و خزمانی خۆیاندا دەیانچاند، بەدەستی ئەوانیش دەکوژران. ئا بەمجۆرە بوو دۆمیتیان[41] بەدەستی *ستیڤان*، *کومۆدۆس* بەدەستی یەکێك لە مەعشوقەکانی خۆی، *ئانتۆنیۆسیش* بەدەستی *ماکرینۆس* کوژران؛ ئەوانی دیکەش کەم تا زۆر بەهەمان شێوەی دڕندە و نامرۆڤانە لەناوبران.

راستی ئەوەیە زۆرداران هەرگیز نەکەسێکیان خۆشویستووە و نەکەسێکیش ئەوانی خۆشویستووە. خۆشەویستی وشەیەکی پیرۆز و روحانییە؛ خۆشەویستی و ئەوین هەرگیز سەرهەڵنادەن، مەگەر لە ناخی ئەوانەدا نەبێ کە خاوەنی کەسایەتییەکی مرۆیین؛ و هەرگیز ڕەگ داناکوتێت مەگەر بەهۆی رێزگرتن و متمانەی دوولایەنەوە نەبێت.

[41] Domitian کوڕی ڤسپاسیانۆس و برای تینوس (جێنشینی باوك) (٥١-٩٦ز)، ئەو برای خۆی، تیتوسی کوشت تا لە شوێنی وی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشێت. سەرەتای پاشایەتیەکەی بە باشی تێپەڕی، بەڵام دوای گەڕانەوەی لە سەفەرە جەنگیەکان، لە ئەنجامی پیلانێك کە هاوسەرەکەی رێکیخستبوو، بەدەستی ستیڤان کوژرا. ئەو دوا (دوازدەمین) قەیسەری رۆم بوو.

خۆشەویستی و ئەوین ئەوەندەی لە میانەی خۆبەخت کردن و فیداکاریدا پێدەگەن، لە لوتف و میهرەبانیدا گەشەناسێنن، ئەوەی دەبێتە هۆی متمانە و دڵنیایی لە نێوان دوو خۆشەویستدا پابەندی و بڕواهێنانە بەراستی و راستگویی: سەربڵندی، خودی راستگۆ، پێداگری گرەنتی خۆشەویستین. لەو شوێنەی بێ بەزەیی، بێ وەفایی و نادادپەروەری فەرمانڕەوان، هیچ خۆشەویستییەك ناتوانێت پێ بگرێ؛ لەو شوێنەشدا کە تەنیا پیسکە و شەڕانییەکان کۆبوونەتەوە نەك هاوکاری و دەسگیرۆیی، بەڵکو تەنیا پلانگێڕی ئامادەیە: مرۆڤە شەڕانییەکان لە ئاست یەکتردا هیچ جۆرە هەست و سۆزێکیان نییە؛ تەنیا ترسە ئەوانی لە ڕێزی یەکتر و لە نزیك یەکەوە هێشتووتەوە؛ ئەوان خۆشەویستی یەکتر نین، بەڵکو لە تاوانەکاندا شەریکن.

ئەگەرچی مومکین نییە، بەڵام بەزەحمەت دەتوانین زۆردارێك بدۆزینەوە هەستی خۆشەویستییەکی راستەقینەی تێدا بێت. ئەو زۆردارەی خۆی لە پلەیەکی بەرزتر لە هەمووان دەبینێ، هیچ کەسێك بە شایانی خۆشەویستی خۆی نازانێت؛ سنوورێکی بۆ خۆی قایل نییە و خۆی لە سەرووی سنووری خۆشەویستییەکەوە دەبینێ کە بناغەکەی لەسەر یەکسانی بەندە و دەبێت تیایدا هەردوو لایەن بەتەواوی لەگەڵ یەکدا بەرامبەر و هاوپێگە بن. لەم ڕوانگەیەوە دزەکان شایستەترن، چونکە بەلای کەمەوە (هەر وەکو گوتوویانە) لە کاتی دابەشکردنی ماڵ و دەستکەوتە دزراوەکان لەگەڵ یەکدا هاوڕێ و هاوپشکن. ئەوان تەنانەت ئەگەر یەکتریشیان خۆش نەوێت یان هاوبیر نەبن، بەلای کەمەوە یەکتری ناشکێننەوە و یەکتر مەحکوم ناکەن. وەلێ نزیکەکانی زۆردارێك هەرگیز بۆ ساتەوەختێکیش هەست بە دڵنیایی و ئاسایش ناکەن، چونکە ئەمان بۆ خویان زۆرداریان فێرکردووە کە ئەو بەهێزترین پیاوە و هیچ هێزێك یاخود



ناچارکردنێك بەسەر ئەودا پراکتیزە ناکرێت و ناتوانێت لە هیچ کارێکی بگێڕێتەوە. کەواتە ئەو خووی بەوەوە گرتووە خواست و ئیرادە و حەزی خۆی وەك بەڵگەیەکی بنەبڕ و نکۆڵی لێنەکراو لەقەڵەم بدات و گەورەی هەمووان بێت، بێ ئەوەی هیچ کەسێك بەشایستە و هاوشانی خۆی بزانێت. لەگەڵ هەبوونی ئەم هەموو نموونە بەڵگەدارانە و وێڕای ئەو مەترسییەی بەردەوام ئامادەیی هەیە، جێی داخە هیچ کەسێك ئەقڵی بەوە نەشکاوە لە شوێنی خۆی ببزوێ و لەپێناو سوودی هەمووواندا هەنگاوێك بنێت، هەروەها لەنێوان کەسانێکی بێ ئەژماردا کە لەپێناوی خۆشیرین کردن و کاسەلێسیدا دەوری دێوەکەیان وەك هەڵقەیەك تەنیوە، یەك کەس پەیدا نابێت ئەو هەست و جۆرئەتەی هەبێت کە وەك لەو چیرۆکەدا، ئەو رستەیەی ڕێویەکە بەو شێرە خۆنەخۆش خستووەکەی گوت، بەزمانی دا بێ: «خۆشحاڵ دەبم بۆ جێ بەجێکردنی ئەرك و ڕێزی خۆم پێ بنێمە هێلانەی خۆتانەوە، بەڵام شوێن پێی زۆران دەبینم تا هێلانەکەی ئێوە هاتوون، کەچی تەنانەت یەك شوێنپێش کە نیشانەی گەڕانەوە بێت دیار نییە».

ئەم بەختڕەشانە، بریسکە و باقی زێڕ و شکۆ و درەوشانەوەی تاج و تەختی زۆردار دەبینن و مات و سەرسام دەبن. ئەمانە کە بەو جۆرە سیحریان لێ کراوە، لێی نزیك دەبنەوە و بێ ئاگان لەوەی کە بەرە و ئاگرێك دەچن بێگومان دەیانسووتێنێ.

یەکێك لە ساتیرەکان[٤٢]، کاتێك بڵێسەی ئەو ئاگرەی بینی کە پرۆمتێ[٤٣] هێنابوویە سەرزەوی، ئەوەندە گیرۆدەی ئاگرەکە بوو و لێی نزیك بووەوە

[42] ساتیر Satyr، کە پێشیان دەگوترێت Silenes، خواوەندان یان فریشتەکانی سروشت بوون کە هەڤالان و پەیرەوکەرانی دیۆنیزیۆس بوون و بە شێوەی جۆراوجۆر دەناسێنران هەروەك ئەوەی کە

و ماچی کردوو و گڕی تێبەر بوو و سووتا. بەهەمان شێوە هەروەك توسكانی شاعیر گوتوویەتی گوڵەستێرە بەدووی ئارەزووەكانیدا عەودالّی بڵێسە دەبێت، چونكە بڵێسە دەدرەوشێتەوە و رووناكایی دەدا؛ گوڵەستێرەش جگە لە گەیشتن بە ئارەزووەكەی خەسڵەتەكانی دیكەی بڵێسەش ئەزموون دەكا كە سووتانە. جگە لەوەی باسمان كرد، تەنانەت ئەگەر دان بەوەشدا بنێین كە جاروبار نزیكەكان و كەسانی دەوروبەری زۆردار لە ئاسایشدا دەمێننەوە و سەرەنجام رزگاریان دەبێت، بەڵام لەو كەسە رزگاریان نابێت كە جێگەی زۆردار دەگرێتەوە، ئەگەر ئەم

---

جار هەبوو نیوەی خوارەوەی لەشیان لە شێوەی ئەسپ و نیوەی سەرەوەی لەشیشیان لە شێوەی مرۆڤدا بوو. هەندێك جاریش نیوەی خوارەوەی لەشی ئەوانیان لە شێوەی دەستی بزندا نمایش كردووە.

[43] پرۆمیتیۆسPrometheus، لە ئەفسانە یۆنانیەكاندا كوڕە مامی زیۆسی خوای خواكانە. پرۆمیسیۆسیش وەك زیۆس لە رەچەڵەكی تیتانەكان دەژمێردرێ. ئەویان بە دروستكەری مرۆڤە سەرەتاییەكان زانیوە و بڕواشیان وابووە كە ئەو مرۆڤی لە گلێكی توند و كارتێنەكراو دروست كردووە، بەڵام هەندێكی تر تەنیا وەك چاكەخوازێك بۆ مرۆڤ تەماشایان كردووە نەك وەك دروستكەری مرۆڤ. ئەو لەپێناوی مرۆڤدا، زیۆسی هەڵخەڵەتاند و لە ئەنجامی ئەمەشدا زیۆس رقێكی توندی لە پرۆمیسیۆس و مرۆڤ هەڵگرت. بەم پێیەش بۆ سزادانی ئەوان بڕیاری دا لە ئاگر بێبەشیان بكات. ئا لێرەشدا دیسانەوە پرۆمیسیۆس بە فریای مرۆڤەوە هات ئەویش بەوەی كەمێك تۆوی ئاگری لە خۆر دزی و لە لاسكی گیایەكدا بەنێوی Ferula شاردەوە و هێنایە سەر زەوی. زیۆسیش مرۆڤ و پشتیوانیكەرەكانی سزادا: بۆ مرۆڤ ئەفرێنراوێكی تایبەتی نارد بەناوی پاندور بۆ سزادانی پرۆمیسیۆسیش لە كێوی قەفقاس بە زنجیر بەستیەوە و فەرمانی بە داڵێك دا تاكو بەردەوام جگەری وی كە هەمیشە وەك خۆی لێدەهاتەوە لەتوپەت بكات و قوتی بدات. زیۆس سوێندی خوارد بوو كە هەرگیز پرۆمیسیۆس لەم بەندە رزگار نەكات، بەڵام كاتێك هەرقل بەوێدا تێپەڕی تیرێكی هاوێشتە داڵەكە و پرۆمیسیۆسی رزگاركرد.



فەرمانڕەوا نوێیە فەرمانڕەوایەكی باش بێت، پێویستە حیساب بۆ رابردوو نەكات و لەئەنجامدا تێبگات كە دادپەروەریەك لە ئارادایە؛ بەڵام ئەگەر ئەویش وەك زۆردارەكانی پێشوو بێ بەزەیی و زۆردار بێت، بەدڵنیاییەوە داروودەستەیەك لە دەوری خۆی خڕدەكاتەوە كە بەزۆری حەز ناكەن هەر جێگەی كەسەكانی پێشوو بگرنەوە، بەڵكو داوای سامان و تەنانەت گیانی ئەوانیش دەكەن. ئایا دەكرێ مرۆڤێك بدۆزینەوە لەو جۆرە هەلومەرجە ترسناك و نائاسایشەدا، هێشتاكەش هێندە چاوچنوك و پایەخواز بێت كە ئامادە بێت وێڕای هەموو مەترسییەكی دارایی و گیانی، خزمەت بەو زۆردارە بكات؟ خوایە! ئەم كارە چ دەرد و ئازار و خوێنرێژییەكی بەدواوەیە ئەوەی كە مرۆڤێك هەموو كاتی خۆی لە خزمەتی خۆشگوزەرانی و كەیفسازی و عەیش و نۆشی یەك كەسدا بباتەسەر و بەم پێیەش، لە هەموو كەسێكی دیكە زێتر لێی بترسێ؛ هەمیشە گوێی لە زەنگی مەترسی بێت؛ لە سێبەری خۆی سڵ بكاتەوە؛ تەنانەت ترسی هەبێت لە هەڵكردنی شەماڵ؛ بەدوای پیلانگێریدا بگەڕێت؛ بكەوێتە نانەوەی تەڵە و داو؛ لە سیمای نزیك و هاوكارەكانیدا بۆ نیشانەی ریاكاری و خیانەتێك بگەڕێت؛ بەدەم هەمووانەوە پێ بكەنێت، بەڵام تا ئاستی مەرگیش لێیان بترسێت؛ متمانەی بەهیچ كەسێك نەبێت. جا چ دوژمنێكی ئاشكراو، چ دوستێكی متمانە پێكراو؛ هەمیشە خۆی ئارام و بێ خولیا پیشاندا لەكاتێكدا بەردەوام دەترسێ و دڵی دەلەرزێ؛ نەتوانێت كامەران بێت و تەنانەت جۆرئەتی ئەوەشی نەبێت كە خۆی غەمگین پیشان بدات.

هەڵبەت لە پاداشتی ئەوەی بەدەستی دەهێنن، ژیانی نەگبەتانەی ئەوان شایانی ئەو رەنج و ئازار و دڵەراوكێیەیە. هەرگیز خەڵك بەو هۆیەی كە دووچاری رەنج و كێشە هاتوون سەرزەنشتی زۆردار ناكەن، بەڵكو كەمتەرخەمی ئەمە دەخەنە ئەستۆی راوێژكار و كارمەند و

دەوروبەرەکانی. نەتەوەکان، توێژەکانی شار و لادێ، جوتیاران و هەر دەستەیەکی خەڵك لە ناساندن و بەیادهێنانەوەی ناوی نزیکەکانی زۆردار و هەڵگێر و وەرگێڕی کردەوەکان، هەرزەیی و پیسکەیی ئەوان و هەڵبەستنی هەزاران تومەت و تاوانی ناشیرین و نەفرەتاوی بۆ ئەوان، لەگەڵ یەکدا کێبرکێ دەکەن. ئەم خەڵکە لە دوعاکانی خۆیان، لە جەخت کردنەوەکانیان و لە بیرەوەری خۆشیاندا، هەرچی نەفرەت و دزێویە ئاراستەی ئەوانیدەکەن. خەڵکی ئەوان بەهۆکاری بەدبەختی خۆیان دەزانن و لە سەردەمێکیشدا کە بەرواڵەت رێزیان دەگرن، لە ناخیاندا بەهۆی ئەو نەفرەتە زۆر و وەڕەزییەی هەیانە، ئەو کەسانە بە شوومترین و ترسناکترین دڕندە لەقەڵەم دەدەن. ئەمەیە ئەو شانازی و سەرفیرازییەی لە بەرامبەر نۆکەری و کاسەلێسیدا، بەنەسیبی نزیکان و یاوەرانی پاشا دەبێت؛ ئەوەش بەدەستی خەڵکانێك کە ئەگەر ئەمانەیان دەست دەکەوتن، لەت و پەتیان دەکردن و هێشتاش دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە و تورەییان کپ نەدەبووەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی تەنانەت کاتێك خزمەتکار و یاوەرانی زۆردار دەمرن، ئەوانەی شایەتی ئەو بارودۆخە بوون و لە دوای ئەوانیش هەر دەژین، هەرگیز هێندە گەمژە نین ناوی ئەم مرۆڤخۆرانە (٢٣) بە مەرەکەبی هەزاران قەڵەم لەکەدار بکەن و لە هەزاران کتێبدا ئیعتبار و رێز و ئابڕۆی ئەوان بسڕنەوە و ئێسقانەکانیان بهێننە پێش چاوی نەوەکانی داهاتوو و بەهۆی ژیانی چەپەڵیانەوە هەتا هەتایە گرفتاری سزا بکەنەوە.

وەرن تا دەرفەت هەیە، چاکە بکەین؛ وەرن لە پێناوی سەرفرازی و ئەو ئیشقەی بۆ چاکە هەمانە و لەپێناوی خۆشەویستی و ستایشی یەزدان کە تاکە شایەدی کردار و تەنیا دادوەرێکی بەویژدانی هەڵە و گوناهەکانمانە، ڕووبکەینە ئاسمان. من بڕوام بە راستی قسەکانی خۆم



هەیە، چونکە هیچ شتێك هێندەی ستەمکاری، دژی کەرامەت و گەورەیی یەزدان نییە - دڵنیام ئەو لە دۆزەخدا شوێنێکی تایبەتی بۆ سزادانی زۆردار و هاوکارەکانیان لەبەرچاو گرتووە.

## پەراوێزەکان

١ـ ئەلیادە، کتێبی دووەم، بەیتەکانی ٢٠٤ و ٢٠٥. (هری کۆرتس)

٢ـ حکومەتی تاکەکەسێك بەسەر هەمووانـدا. لە وشەی یۆنانی Monos (یەك، تاك) و arkhein (فەرمان و فەرمان دەرکردن). {هـ. ك}.

٣ـ ئەنجومەنێکی ئۆتۆکراتیە لە سی دادوەر پێکهاتبوو و ساڵی ٤٠٤ پ. ز. بۆ ماوەی هەشت مانگ شاری ئەسینایان بەڕێوە دەبرد. ئەوان ستەمکاریەکی ڕەهای ئەوتۆیان هێنابووە ئاراوە کە خەڵکی ئەسینا لەدژیان ڕاپەڕین و شاربەدەریان کردن {هـ. ك.}

٤ـ جەنەڕاڵی ئەسینی، ساڵی ٤٨٩ پ. ز. کۆچی دوایی کردووە و هەندێك لە شەڕەکانی بریتین لە: هێرش کردنە سەر وڵاتی سکایەکان (Scythians)؛ لێمنۆس (Lemnos)، ماراتۆن (Marathon)، کە لەوێ داریۆشی پارسی شکا. {هـ. ك.}

٥ـ پاشای سپارتا، ساڵی ٤٨٠ پ. ز لە تێرمۆپۆلا (Thermopole) کۆچی دوایی کرد، کە پارێزگاری لە ڕێڕەوەکە دەکرد لەبەرامبەر خەشایارشا لەگەڵ سێسەد جەنگاوەری سپارتی.

٦ـ سیاسەتمەدار و جەنەڕاڵی ئەسینی، ساڵی ٤٦٠ پ. ز کۆچی دوایی کردووە. شەڕەکانی ئەو بریتین لە: لەشکرکێشی بۆ Aegean Isles؛ و سەرکەوتنی لە شەڕدا لەگەڵ ئێرانیەکان لە سەردەمی خشاریارشا لە سالامیس (Salamis) {هـ. ك}

٧ـ بنەچەی ئەم ڕووداوە دەچێتەوە سەر بەپیرۆزکردن و هەڵبژاردنی شائول لەلایەن شەموئیل (ساموئێل)ەوە. {هـ. ك.}

٨ـ ئەسکەندەری مەقدونی لە دانیشتنی کۆرینت (Corinth) دا بە فەرمانڕەوای هێلینیەکان هەڵبژێردرا، ساڵی ٣٣٥ پ. ز. {هـ. ك.}



٩ـ فەرمانڕەوای ستەمکاری ئەسینا، ساڵی ٥٢٧ پ. ز. کۆچی دوایی کردووە، ئەو بۆ کۆنترۆڵ کردنی شار دەستی بە فریودان و بەرپاکردنی ئاژاوەگەلێك کرد و ناچار بوو چەند جارێك لەشار هەڵبێت. {هـ. ك.}

١٠ـ دەنیس یاخود دیۆنیسیۆس، فەرمانڕەوای ستەمکاری سیراکوس (Syracuse) ساڵی ٣٦٧ پ. ز. کۆچی دوایی کردووە، ئەم دیکتاتورە کە لە خێزانێکی سەر بەچینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگادا لەدایك ببوو، بە پەنابردنە بەر پیلانگێڕی و لەڕێگەی کوشتن و بڕین و کودەتاوە گەیشتە دەسەڵات. ئەو لە کاتی هێرشی کارتاژیەکاندا شاری لە مەترسی ئابلۆقەدان ڕزگار کرد. {هـ. ك.}

١١ـ دیونیسۆس لەساڵی ٤٠٥ پ. ز. لە سیراکوس بە دەسەڵات گەیشت. {ماری ئان. ڕۆتبارد}.

١٢ـ میهرداد (میتریداتس) (لە دەوروبەری ١٣٥ـ ٦٣ پ. ز.) یەکێك بوو لە نزیکەکانی هانیبال و، ترسناکترین و بەهێزترین دوژمنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم. ئەوەی لێرەدا لەبارەی ئەوەوە هاتووە پەیوەستە بە سەردەمی لاوێتی ئەوەوە کە چەند ساڵێك لە چالاکی نواندن دوور کەوتبووەوە و لەو ڕۆژانەدا، بۆ پاراستن لە ژەهر خۆی بەهێز دەکرد. ئەو لە ڕۆژانی پیریدا، لەکاتێکدا لەپێمپویۆس شکابوو و لەلایەن کوڕەکەیەوە خیانەتی لێکرابوو، ژەهری خواردەوە تاکو خۆی بکوژێت، و دواجار ناچار بوو پەنا بۆ خەنجەری برادەرێکی فەڕەنسی ببات. (پلاینی Plainy، مێژووی سروشتی، XXIV، ٢) {هـ. ك.}

١٣ـ فەرمانڕەوای ڤینیسیا. {ماری ئان. روتبارد}

١٤ـ کەسایەتیەکی نیمچە ئەفسانەیی کە بەگوتەی پلۆتارك، ژیانێکی تەمومژاوی هەبوو. ئەو یاسایەکی توندی بۆ نیشتمانەکەی بەمیرات هێشتەوە کە مەسەلەکانی پەیوەست بەزەوی، کۆمەڵەکان، خوێندن و هەروەها ملکەچی تاکەکەسی لە حکومەتدا ڕووندەکردنەوە. {هـ. ك.}

١٥ـ ئودیسـه، کتێبی دووەم، بەیتـەکانی ١٤ـ١٩ سـیمەریەکان میللـەتێکی ناشارستانی و دڕندە بوون کە لە سەدەکانی ٧ و ٨ پ. ز. لـە بـاکوری دەریـای رەش دەژیان و ناوی ئەمڕۆی «کریمێ» لەوانەوە بەجێ ماوە. {م. ن. ر.}

١٦ـ عوسمان (Ottoman) سولڵتانی قوستەنیتنیە، زێتر بـە نازنـاوی Turk Grand ناسرابوو. {م. ن. ر.}

١٧ـ بروتوس و کاسیۆس بەشداریان لە تیرورکردنی یۆلیۆس قەیسەر لەساڵی ٤٢ پ. ز. کردبوو. ئەوان دوای تێشکانیان لە مارکۆس ئانتۆنیوس لە شەڕەکانی فیلیپیPhillippi لە ساڵی ٤٢ پ. ز. خۆیان کوشت. { م. ن. ر.}

١٨ـ نزیکـەی سـێیەکی ئیمپراتۆرەکـانی رۆم بەدەسـتی سـەربازەکانیان کوژران. { هـ. ك.}

١٩ـ گوێ بڕین وەك سزای دزی، سزایەکی زۆر کۆنە. لەسەدەکانی نـاڤینیش لە سەردەمی حکومەتی سـەن لـویی ئـەم سـزایە پیـادە دەکرا. ئـەو پیاوانـەی گوێیان بڕابوو و بـەم شـێوەیە سـوك کرابـوون، رووخسـەتی چـوونە نـاو کـۆڕ و کۆمەڵەی ئایینی یان کۆمەڵی دادوەرەکانیان پێ نەدەدرا. {هـ. ك.}

٢٠ـ چیرۆکێکی ئیزۆپ (Aesop) ە. {م. ن. ر.}

٢١ـ ئەشیل (ئەسکیلۆس)، برگەی «پرۆمتێ، ئەوەی ئاگری هێنا» . {م. ن. ر.}

٢٢ـ پـترارك، Canzoniere سـونێتی ١٧. لابـوتی ئـەو دێرانـەی لـەبارەی گوڵەئەستێرەوە هەڵبژاردوون. {م. ن. ر.}

٢٣ـ هـۆمێر لـە بەرهەمەکەیـدا ئـەلیادە، کتێبـی یەکـەم، بـەیتی ٣٤١ ئـەم زاراوەیەی بەکارهێناوە. {م. ن. ر.}